# ئەنفال

لە مەنفاكانی ناسیونالیزمەوە

بۆ

كوشتنی زمان و جەستە

حسێن سۆران

# ئەنفال

## لە مەنفاکانی ناسیۆنالیزمەوە

## بۆ

## کوشتنی زمان و جەستە

لێکۆڵینەوە

چاپی یەکەم
٢٠١٠

- ئەنفال لە مەنفاکانی ناسیۆنالیزمەوە بۆ کوشتنی زمان و جەستە
- بابەت : لێکۆڵینەوە
- نووسەر: حسێن سۆران
- پیت چنین: ئاسۆ
- دیزاینی بەرگ: ئارام لقمان
- چاپ: چاپی یەکەم ٢٠١٠
- چاپ: چاپخانەی رەهەند _ سلێمانی
- هەڵەبری : تاهیر زاهیر
- تیراژ: ١٥٠٠ دانە
- نرخ:(٤٥٠٠) دینار
- ژمارە سپاردنی (١١١٣) بەڕێوەبەرێتی گشتی کتێبخانە گشتیەکانی بۆ ساڵی ٢٠١٠ی پێدراوە

# ناوەرۆك

## بەشی یەكەم



## بەشی دووهەم



## بەشی سێهەم

## بەشی چوارەم



## بەشی پێنجەم

# بەشی یەکەم

- ❖ لە بێدەنگی زمانی قوربانیەوە بۆ زمانی ئەنفال
- ❖ زمانی ئەنفال‌و بیرکردنەوە لە جیهانێکی دیکە
- ❖ سایکۆلۆژیەتی شەڕانگێزی‌و جینۆسایدی کورد
- ❖ سایکۆلۆژیەتی دەمارگیری
- ❖ ڕۆڵی ڕاسیزمی خێڵەکانی عەرەب لە ئەنفال
- ❖ ئەنفال‌و جینۆساید

# له بێدەنگی زمانی قوربانیەوە بۆ زمانی ئەنفال

مادامێك قسه لەسەر ئەم دونیایه دەکەین کـه مێژوییه،دەشێت وا مامەڵـه لەگـەڵ کوشـتارە گەورەکـەی ئـەنفال بکـەین کـه هـەم ئوستورەیە و،هەم داستان و هـەم مێژویـەکی بـێ وێنـەی لـەزەتی کوشتن کەلە دونیادا هاوشێوەی کەمە!

لەکاتی تێڕامان لە مـرۆڤ و مێـژو ئەفسانه و داسـتان ،ئەمانـه پلـه وپایەیـەکی تایبـەتیان هەیـە..وەك داسـتان،ئەو داسـتانەی ڕوداوەکان،کارەسـاتەکان و کارەکتەرەکان لـه دەوری خـۆی کـۆ دەکاتەوە،دەبێتـه چەقێك بۆ شتەکان ئەگـەر نەبێتـه پێـشڕەوی شـتەکان....هـیچ لـەزەتێکی کوشتن بـه ئەنـدازەی کوشـتارە گەورەکـەی ئـەنفال بێـدەنگی لێکەوتـەوە،چ لەئاسـتی نـاوخۆی عێـراق و چ لەئاسـتی دونیـا....بەپێشـچاوی دونیاوە،فارگۆنـەکانی مەرگ ، پڕلە جەستەی زیندوی بێئاگـاترین و سـادەترین مـرۆڤ لـه سەدەی کوشتارە گەورەکانی دونیا بەبەرچاوی مافـەکانی مـرۆڤ و دونیـای مـۆدێرنو کۆمـەڵگای بەشـەریەوە تێپـەڕی و بـێ ئـەوەی موچـوڕکێك بـەگیانی هـیچ یـەکێك لـه دۆسـتانی ئـەمڕۆی کـورد ودوژمنـانی دوێنـێ نەهێنا،بـەڵکو بـه پێـچەوانەوە تاکـه فاکتـەری

سیاســـەتی جیهــانی بەرژەوەنــدی تایبــەتو پەیوەندیــەکانی سیاسەتی نێودەوڵەتی ئەو سەردەمەی بەڕێوە دەبرد.

لەڕوی داستان و ڕوداوە مێژوییەکانەوە "لیوتار"نوسیویەتی:

_بـیرو کـرداری ســەدەیی نۆزدەهــەم و بیــستەم لــە لایــەن ئایدیاکانــەوە ڕوداوەکــان ڕێکدەخات،لــەو داســتانانە بــە قــسەی لیوتار:_داستانی مەسیحیانەی رزگاربوون لـە گونـاه سـەرەتایەکە لەڕێگەی عیشقەوە...داستانی ڕۆشنگەری دەربارەی ڕزگاربوون لە جەهالـەت و کۆیلـەتی لەڕێگـەی یەکسانیەوە، داسـتانی تێڕامـانی بەدەســـتهێنانی ئایـــدیای گـــەردونی لەڕێگـــەی دیالـــەکتیکی کۆنکرێتیەوە..داستانی مارکسیزمیانەی ڕزگاربوون لە چەوسانەوە بۆ بەخۆنامۆبوون لەڕێگەی بەسۆسیالستکردنی کارەوە..داسـتانی سـەرمایەدارانەی ڕزگـاربوون لـە هـەژاری لەڕێگـەی گەشـەکردنی تەکنۆپیشەسازیەوە،داستانی تەنیا گەورە ڕوداوەکان ڕێنمای ناکـا بـەڵکو مەشـروعیەتیش بـەڕوداوەکان دەدا،مانـا بـە کردەوەکـانی دەبەخـــشێ....داســـتانی ئـــەنفالیش داســـتانێکی شـــەرمن و تێکـشکاوترین هێــزی ڕۆحـــی و بەشـــەری ومـــەعریفی گـــەلی کــوردە....داســتانی گــەورە گێڕانــەوەی ئاوەهــاش بــەردەوامی ئەوداستانەی ئێمە لە شێواز و زمانێکی ناسازی ئاوەها،قسەکردنە لە میکانیزمی پێناسەی خود،لە هەمان کاتیشدا جیاکردنەوەی لـە

داستانی گەورە و بەهێزوتوانا بەبەری جەستە و عەقڵ دەکاتەوە،توانای بەرگری بە جەستە و گروپ دەبەخشێ...

هەروەك لیوتار دەڵێ:

لە موبارزە و جەنگ لەپێناوی سەربەخۆیدا داستانی گەورە وەك میکانیزمێك دەبێتە سەرچاوەی هێز و تواناکان،هێزی داهێنەر،داستانی ڕەوایەتی ،بەهەمو جۆرە شێوازەکانی بەرگریکردن و روبوڕوبونەوە دەبەخشێ،ڕەوایەتیش مافێکە لەلایەن هێزی میکانیزمی داستانەوە پارێزراوە،سەروەری بەسەر کات و لە ئەنجامیشدا بەسەر ژیان و مەرگدا مسۆگەر دەکات نەك ئەوەندە بەڵکو داستان خۆیی دەبێتەسەرچاوەی دەسەڵات،ئەو دسەڵاتەی ئێمە لەوان جیا دەکاتەوە،داستان ناو لە شتەکان دەنێ.

بەدرێژایی بیست ساڵە ئاوەها شێوە میکانیزمێك بۆداستانە هەتیوەکەی کورد نابینرێ و دەرئەنجامەکانیشی تەنها بەرهەمی کۆمەڵگایەکە قارەمانپەرستی ومێگەلپەرستی لێکەوتەوە !

تێرامان بۆ لە شکری کوژراوەکان کە بێ شوناس و بێ زمان وبێ ناو بێ شوێن و بێ کاتی وەکو ئەنفال بۆخۆی دەمانخاتە بەردەم رەواڵەودەرئەنجامێکی نادیار و پەیی بردن بۆ چەمك وزاراوەکان...وەك ئەفسانەو تراژیدیا ...جینۆساید...شەری

دەرونی..داستان و قارەمان پەرستی مێگەلپەرەستی و بێدەنگی و دلڕەقی هتد....

..تاوەکو بتوانین لە بەر تاریکی سێبەرە گەورەکانی مردن زاتی ئەوە بکەین لە بەردەم تەپۆلکەی پرتەرم و ڕۆحی هەلاهەلای نەتەوەیەك ڕاوەستین و قسە لە سەر زمانی جەستەو چێژی کوشتنی خۆمان بکەین،قسەیەك دەر ئەنجامێکی ئەوخوێن ڕشتن و سڕینەوەی لێبکەوێتەوە..بۆ گەیشتن بە سەرەتاکانی دەروازەی مەرگ دەبێ سوالٌ و قەرزی فەلسەفەو ئاستی فیکری گەورە بکەین تا لەدەرگا دۆزەخێکەی ئەنفال بدەین.

بیست سالە هەمومان دەلێین ..بۆ چی ئەنفال ؟ بۆ چی بێدەنگی؟ داخۆ ئەمە سەرچاوەکەی لە کوێوە هاتوە؟ ئاخۆ ئەم دەمارگیرییەی مرۆڤ لە سەرەتای بوونییەوە تائێستا کە هەڕەشەی کۆتابونی خۆی دەکات لە چیەوە سەرچاوەی گرتوەو بۆ چی؟ ئاخۆ ئەنفال بە شێوەیەکی گشتی و تایبەتی پرسێکی جیهانیە یان لۆکالٌ؟ ئاخۆ جینۆساید وکێشەو گرفتێکی ئینسانیە یان کورتکراوەی نەتەوەکانی بندەستە؟ ئاخۆ ئەنفال عەقلێکی پێش وەختە یان زمان یان کردارێکی سەرە رۆیە؟ ئاخۆ پرسێکی ئەزەلیە یان مێژووی ئۆرگەنەکانی سیاسین یان مرۆی؟

ئاخۆ ئەنفال لە بناغەدا کێشەی وجودی ئینسانە؟ ئەی بۆ ئەنفال لە ئاستە جیاجیاکانی ژیان لە ژێر دەستی خودی مرۆی بەردەوامە بە هەزاران شێوە؟ ئەی ئەنفال وەك عەقڵ وزمان و کردار دەگاتە کوێ لە ئارەزوی کوشتنەوە بۆ فەرامۆشکردن و دلڕەقی و بێدەنگی؟ ئاخۆ ئەنفال تاوانی ئاینەکانە یان راستەخۆ ڕۆحی شەڕانگێزی مرۆڤە؟.ئەی بۆ چی کەسی دەمارگیر کەسێکی {خودشەیدایە}و هەست بە هیچ پەیوەندیەکی جیهانی دەرەوە ناکات؟ئاخۆ هەمو ئەمانە پێویستی بە عەقڵ و ڕۆشنبیری گەورە نیە بۆ دەربازکردنی مرۆڤ لە مرۆڤی کێوی و گواستنەوەی بۆ کەنارەکانی ئینسانی هاوچەرخ و مرۆڤدۆستی ؟ئەم وزە شاراوە سەرە ڕۆیە چیە وا لە مرۆڤ دەکات زۆربەی حەقیقەتەکان دەزانێ و کەچی هەمیشە ئارەزوی کوشتن ولەزەت و دەسەلآت دەکات؟ ئاخۆ مرۆڤ هەر خۆی سروشتێکی شەڕانگێزی هەیە یان هێزێکی مەعریفی و ئەفسانەیی و بەربەریی لە پشتی ئەم بۆچونانەوەیە؟ ئەمە ودەیان پرسیاری تر لە سەدەیەکەوە بۆسەدەیەکی دی هەمیشە ڕاومان دەنێت بێ ئەوەی چارەسەرێکی بنەڕەتی گونجاو بۆ فۆبیاو شێرپەنچەکانی مرۆڤ بدۆزینەوە.دوا پرسیاریش ئەوەیە ئاخۆ مرۆڤ دوا بڕیاری کۆتای یەکجاری ڕەگەزی خۆی داوە؟ یان

هێشتا له پلان وئامادەکاری وردی سەرەتایە...بۆ ئەم پرۆسە گەورەیە؟..

له رێگەی کارەساتی گەورەی ئەنفالی گەلی کوردەوە نا چارین لە هەندیك لەو چەمك وزاراوانە ئاشکراکەین کە بونەتە هۆی دروستکردنی ئەنفال کە لە کۆی پرۆسەی کۆمەڵگەی ئینسانی کە هەر جارەی لە لایەکەوە ڕوو لە مرۆڤایەتی دەکات ئەویش بێ پرسیار و بێ باکی بەلایدا تێدەپەرێ و جەلادەکانیش پاداشت دەکرێن و دەبنە شەخسیەتی مێژوی و جیهانی و قوربانێکانیش دەبنە پلەیەکی بەرزتر و کۆنکرێتی بۆ مانەوەی دەسەڵاتی ستەمکاری کە خواستی بە شێکی زۆری کۆمەلگای بەشەریە.

ئەم هەستکردنە وەکو ئەریك فرۆم دەلێ:_ هەمیشە دەرئەنجامی یان بەرهەمی پەیوەندی نێوان کەس و دونیایە ،بۆیە کەسی دەمارگیر لە ڕاستیدا هەست بە هیچ نا کات وە بەدەست ئەم بێ هەستیەوە دەنالێنێت ،کەسی نەرجسی ناتوانێ دەرك بە واقعیەتی بونی کەسی بەرامبەر جودا لە خۆی بکات وە ئاراستەی بۆ دونیای دەرەوە واقعیەتی دەرەوە کەم دەبێتەوە...یان بە تەواوەتی دادەبرێت ،ئاراستەی بۆ خۆی زیاتر دەکات،خۆی بە تایبەتی جەستەی خۆی ،جوانی خۆی لادەبێتە گرنگترین واقعیەت..نەرسیزم وەك فرۆم دەلێ:_خرۆشێکە لە

کەسانێکی بێ شوماردا تەنها بە هۆی ئارەزوی سێکس ،ئارەزوی زیندومانەوە قابیلی ئەندازە گیرییە..مەرگ پەرستەکان هەمیشە بە قولی لە ژیان دەترسێن... ترسنۆکترین کەسانێکیش سەرۆك و پیاوانی پاشایە کە پردی پەرینەوەی مرۆڤی ژیان دۆستە بەرەو کاریزما...چونکە پێ وایە ماهیەتی ژیان نارێك وپێکە و دەسەلاتدارێتی و زالبون پەسەند ناکات .

مەرگپەرست،عاشقی دەسەلاتدارێتیە، وەلە کردەی زالبون و دەسەلاتداربوندا ژیان دەکوژێت ، بە تەنها لە گەلْ شتێکدا دەتوانێت پەیوەندی بەرقەرار بکات کە مولکی خۆی بێت و ژیان لە پێناوی مولکەکانیدا پەخش دەکات ، هەرچەندە لە ڕاستیدا دوای ژیان ئیدی مولکداری بوونی نیە ومرۆڤ کە مرد کۆتای بە مولکداری تایبەتی خۆی دێ ،بەلام لای ئەو گرنگە {هەبون} نەك بون..لە ڕاستیدا بەختیاری مرۆڤ لە بوندایە نەك لە هەبوندا،گرنگ لای ئەو یادەوەریە نەك ئەزمون،عاشقی سیستم و رێکوپێکی یاسایە، لە لای مرۆڤی عاشق بەژیان بە ڕای فرۆم :_ڕو بە رووبونەوەی بونیادی مرۆڤ لە نێوان ژن و پیاوان دایە ،بەلام بە لای کەسی مەرگپەرست لە نێوان تاکە کەسێکدایە کە توانای کوشتن و ئەو توانایيەی نیە ،لای ئەو تەنها دوو ڕەگەز هەیە بکوژ وکوژراو..جەلاد و قوربانی .

فرۆم پێ وایە :ئارەزوە سێکسیەکان دەتوانن ژیان بخولقێنن بەلام هێز کە تایبەتمەندی مرۆڤی مەرگپەرست مەیل و وابەستەگیەتی بە هێزەوەیە..کە پێناسەی(سسێمون وایل) تواناو قابلیەتی گۆڕینی مرۆڤێکە بۆ جەستەیەکی مردوو دەتوانێت نابودیکات وله دوا شیکردنەوە دا هێز ڕاستەوخۆ پابەندی یان لە سەر بنچینەی توانای کوشتنە.

مرۆڤ کاتێک دەگاتە یەقین و بڕوابون بەرەهایەک ئیدی ئینسانیەتی خۆی لە دەستداوە ،چونکە مانای چالاکی عەقڵ و بیرکردنەوەی وەستاوە ،مرۆڤبون مانای عەقڵ و بیرکردنەوە هاوشانی تێڕامان و جیهانبینی،بیرکردنەوەی زیندوو کە توانای دەرکی دونیا و پێکهێنانی دیدی تاکە کەسی هەبێت ، ئەگەر نا کەسێك لە ئێستادا بە هەمان عەقڵ و بۆ چونی لەوە وبەری باو باپیرانی بیربکاتەوە ئەوا لە ڕاستیدا بیرناکاتەوە،بەڵکو بیرێك و یان ڕاستی دۆگمیك دەگوێزیتەوە کە بیرێکی مردوە خەسلەتی بیرکردنەوەی لە دەستداوە توانای بەردەوامبونی نیە...مانای بوەتە ئایدۆلۆژیا ، ئایدۆلۆژیاش هەمیشە بەربەستێکی مەعریفی پێکدەهێنێت کە فیکر و زانست بە بنبەست دەگەیەنێت ...ئەمەش بە هۆی ئەوەوەیە کە مرۆڤێك کاتێك دەگات بە یەقینێکی تەواو ئیتر گەیشتوەتە کەسێکی ڕوت کە بەرانبەر بە

دونیای دەرەوە لە لای ئاستی بوندا گەیشتوەبە سفر، چونکە ئەوبتە ئەو موطلەق گەراییە دەیپەرستێت بە شتێك خودی خۆی تیادا بلندکراوەتەوە، بە مەفهومی ئالتۆ سێریش بونی ئایدۆلۆژیا بە هۆی خود ولە پێناوی خودایە.

ئایدۆلۆژیا یەکێکە لە کۆلەکە سەرەکیەکانی بەرهەمی فاشیزم وەکەسی کاریزمی و قارەمانپەرستی و قبولکردنی مێگەلی..ئایدۆلۆژیا خود ئامادەکردنێکی بەرنامە رێژە لە سەر رێتمی تۆتالیتار و شوبهاندنی جەستەی مرۆڤ ، مەبەستی سەرکردە و ئەمیرو پاشان وەکو کەسی موقەدەس ،لە رێگەی ئایدۆلۆژیا بەردی بناغەی مۆسەساتی حزبی و فاشیزم وتۆتالیتاریزم جاڕی ئەبەدی خۆیداوە ..لێرەوە بە پێویستی ئەزانم ئایدۆلۆژیای سیاسی و حزبی بخەمە ژێر پرسیار و توێژینەوە کە یەکێکە لە فاکتەرە گرنگەکانی دروستبونی ئەنفال چی لە لایەن صدام حسین وتەواوی حزبەکانی عێراق بە کورد و عەرەب وبەشەکانی ترەوە کە میکانیزمی ئامانجە بالاکانی دەسەڵاتن ، هەروەها رۆلیٚ تەقدیسکردنی ئایدۆلۆژیا کە بەرەو کۆمەلگەیەکی بێدەنگ ومێگەلی بردین ...جگە لەوە کوشتارە گەورانەی ئەم سالانەی دوای کە لە ژێر چەتری ئایدۆلۆژیا جۆرا وجۆرەکاندا کوشتاروستەمکاری گەورەی لێکەوتەوە.

پێبەخشینی ئایدۆلۆژیا وەك موقەدەس وەك هێزێکی ڕۆحی و فیکری و فریادڕەس وەك تاکە سەر چاوەی زانست و پێگە کۆمەڵایەتی شیاو بۆ دونیای هەوچەرخ ،وەك ئەفسانە و قارەمانپەرستی لە منداڵدانی ئایدۆلۆژیاوە وبەشێکی گرنگی سەرچاوەکانی فاشیزم و کەسایەتی کاریزمی وسوپەرمانی فیکری لە دونیای ئێمە بە زەقترین و خوێناویترین شێوە ڕەنگی دایەوە .

خەمێکی گەورەتریش لەمساڵانەی دوایدا بەدی دەکرێ ئەویش قسەکردنە لەسەر کارەساتی ئەنفال بەو شێوە سەقەتەی ئێستاکە دەیبینن..کە ڕۆشنبیر و نوسەری جدی زات و جورئەتی ئەو شێوە نوسینانە ناکات کە هەندێ کەناڵ و میدیا و نوسەری جاهل دەینوسن..ئەگەر سەرنجیش بدەین بەشێکی زۆری ئەو کەس و قەڵەمانە لە نەوەی بەعس و قەڵەم بە دەستەکانی بەعس بون لەسەر ئەم کارەساتە دەنوسن تا لەو ڕێگەیەوە مێژوی پڕشەرمەزاری خۆیان پاك کەنەوە و جۆرێك هەیبەت بە خۆیان بدەنەوە..بە سود وەرگرتن لە کارەسات و تراژیدیای نەتەویی ڕەنگێکی جوانتر بدەن بە خۆیان ئەگەر بگەڕینەوە بۆسەر ئەم جۆرە مەهزەلانە دەبینین لە سنوری چەند کەڕولاڵێك تێناپەڕێت کە نوسینیش شەرمەزار دەکەن و لەسەر خوانی کوژراوەکان مێژویەکی دی بۆخۆیان دروست دەکەن، وەك بڵێ مێژوو پێکهاتوە

له ئێستا نەك له ڕابردو و داهاتوو..بەدرێژایی ئەم ساڵانە تەنها جاهیلەکان و نەزانەکان بە سنگ دەرپەڕاندنەوە ئینشا نوسەکانیان بخەنە سەر زبالەی شەقامی کوردی کە تەنها قسەکردن لەسەر ئەو مەرگەساتە نییە.

کێشەی ئەم جۆرە نوسەرانەش گرفتی خەمی ئەنفال نییە بەئەندازەی ئەوەی هەوڵی پاك کردنەوەی مێژوی خۆیان دەدەن، هەندێکیان جاش بون و هەندێکی تر قەلەم بەدەستەکانی بەعس و کەسانی تریشیان بە پەیژەی فتووە و طلائعی بەعس بەرەو ڕەفیق حیزبی سەردەکەوتن.بۆیە مەهزەلەی بەناو ناوەندی ڕۆشنبیری کوردی گەیشتوەتە ئاستێك هەروەك چۆن لە بەعسایەتی کردنی ساڵانی بەعسیزم بێ شەرم بون،ئاواش بۆ پاك کردنەوە لە مێژوی جاشایەتی و قەڵەم فرۆشی هەمیشە تامردنیان دەستبەکار دەبن بۆ سڕینەوەی مێژوییەك کە مومکین نیە.

ئەوەش بەو مانایە نیە کەس بۆی نیە لەسەر ئەنفال بنوسێ..بەپێچەوانەوە خەمی گەورەی زۆر نوسەری جدی ئەوەیە کە لەسەر ئەنفال نەنوسراوە..یان ئەوەشی نوسراوە چەند کەسانێك نەبێ سەرپاکی گەڕەلاوێژکردن و قسەی بەردەرگای ناو کۆلانەکانن.

ئێمە دەبێ بپرسین دوای بیست ساڵ بەسەر ئەنفال تێپەڕی چ گۆڕانێك بەسەر كولتوری ئێمەدا هات؟سیستەمی عەقڵی و زمانەوانی ئێمە چی بەرهەم هێناوە؟ئاخۆ ئەنفال ئەو بێدەنگیە قوڵەی ئێمەی لەخەو هەستاند؟یان تا ئەمڕۆ لە ترسناكترین بێدەنگیدایە؟

ئاخۆ دوای ڕاپەڕین چەند زمانی جەلادی تر هاوشێوەی بەعسیەكان لە كاردان بۆ تێكشكاندنی تاكی كوردی؟ئاخۆ زمانی ئەنفال تاچەندە بوەتە ئامێری كۆنترۆڵكەر لە ئەنجامی بێدەنگی زمانی قوربانی؟پاداشت و قەرەبووكردنەوەی ئەنفال لە پاداشتی چەند بزن و بەتانییەكدایە؟ یا بەڵكو كاركردنە بۆ سڕینەوەی شوێنەوارە قوڵەكانی ئەو ڕۆحە شەڕانگێزو ئەو سیستەمە مەعریفییە.باشترین نمونەی ئێمەش دەسەڵاتی قێزەونی كوردیە كەبە شێوازی ترسناكتر ئەم زمان و پرۆسەیە ئەنجام دەدات بێئەوەی مرۆڤی سادە هەستی پێبكات.

من وای بۆ دەچم دوای كوشتنی صدام حسێن ئێستا چەندان ملێون صدام حسێنی تر بەشێوازی جۆراوجۆر لە كۆچە و كۆڵان و شەقامەكان ، لەناو ماڵ ومزگەوت و قوتابخانەكان داهێنانی صدامیانە دەكرێ ، ڕەنگە ئێستا صدام حسێن زیندوو بكرێتەوە بڕێكی باش لەم كولتورەی ئێستا لەسەر ڕابردوی خۆی زیادبكات.

ئەنفال ئەمڕۆ زمانێکی ترسناکتر و نهێنیترە لەدوای بەعس لەسەر ڕۆحی ئینسانی کوردی ئەنجام دەدرێ، ئەنفال ئەمڕۆ زمانێکی سایکۆلۆژی وەرگرتوە بۆ بە مێگەلکردن و کوشتن و ئیهانە کردنی کەرامەتی ئینسان، شێوازێکی دیکەی سیاسیە بەتایبەتی بۆ سیستەمە تۆتالیتارەکانی ئەم ناوچەیە.

خەمی هەرەگەورەی ئەمڕۆی ئێمە ئەوەیە کە صدام و دارودەستەکەی ڕۆشتن و ئەنفال لەڕۆخسارێکی تر و عەقڵێکی تر و ستەمێکی تردا بەردەوامە.کوشتنی ئەوانیش هیچی بۆ جێ نەهێشتین جگە لەو نهێنیانەی کە ئەرکی سەرشانی ئێمەیە لەسەردەمی صدام و لەسەردەمی سیستەمی تازەی کوردی ئاشکرایان بکەین.

لەناوبردنی جەلادەکان بەناوی یاساوە بەشێوەیەك لە شێوەکان هیچ کارێکی پۆزەتیفی لەسەر ئاستە سیاسی و کولتوریەکان بەجێ نەهێشت، کە ئاوڕ لە ڕابردوی خۆمان دەدەینەوە دەنگی ستەم و شەهیدەکانمان دێ کە بۆ داهاتوش دەڕوانین هەر خێڵی حیزب و جەهلە بەدوامانەوە دێ..کەواتە سیستەمی زمانی و عەقڵی و ئاستی ڕۆحی ئەنفال جارێکی تر گریانێکی بەسوێ پێ بەخشین..کە زۆر ترسناکترە لە کوشتنی جەستە، گریانی پاشماوەکانی ئەنفال و نەوەکانی ئەمڕۆ گریانە بۆ

ئەوانەی لە داهاتوو دێن و شەڕی ژیان دەکەن،ئەوانەی هەموو ڕۆژێ دەکوژرێن و زیندوو دەکرێنەوە و بە مردویی بەپێوەن.

سەدەی بیست سەدەی جەنجاڵ وترسناکترین قۆناغە کە مرۆڤایەتی بەخۆێن و فرمێسك و سەرسوڕمانەوە ماڵئاوایی لێکرد...سەدەی شۆڕشە تێکشکاو هەرەسە بێکۆتایی و تێکشکانە یەك لەدوای یەکەکانە...باشترین پێناسە بۆ ئەم سەدەیەش،سەدەی تراژیدیایە ، ئەو قوربانیانەی لافاوی خوێنیان بەری نەگرت،ئەو مرۆڤانەی لەناو تاریکترین چرکەساتەکانی مردن و قڕکردن بە خەونەکانیان نەگەیشتن،تەنانەت خەونی مردنێکی سروشتیشیان نەبینی.

سەدەی بیست حیکایەتێك نییە باس لە ئاکامی مردنەکان بکات، باس لە بێ زمانی قوربانی بکات ، ئەو قوربانیانەی بێ ئاگابون لە بونی خۆشیان، ئاخۆ ئەو میلەتەی بە بێدەنگی قڕبکرێ و ئەتك بکرێت زمانی هەیە؟یان ئەوەی ئامادەیە زمانی کوشتنە لە غیابی زمانی عەقڵ و ژیان دۆستی؟

سەدەی بیست وەك بەختیارعەلی دەڵێ:سەدەی پەشیمانیە،خەمە بۆ ئەو قوربانیانەی هەڵوەران و هیچمان لێیان نەچنیەوە،تەنها پەشیمانییەکی گەورە نەبێت!سەدەی بیست سەدەی هەڵاتن و هەستانەوەیەکی نادیارە بەرەو کارەسات و

ئەنجامەکانی..هەموو لایەك دان بە تێکشکانەکان دەنێت،بە بێ ئەوەی پرسیارێکمان لادروست بکات!بەڵام دەبێ چی بکرێت تا ئەنفالێکی تر بەشێوازێکی تر روو نەداتەوە؟چ مەنهەجێکی کارکردن بۆ خوێندنەوە و تەفسیر بەکار بهێنین؟

یەکێك لە سیفەتە ترسناکەکانی یراژیدیا ئەوەیە..وزەیەکە لەسەر چارەنوسی ئادەمیزاد کاردەکات،ئاماژەیە بۆ مەترسیەکی بەردەوام ، ترسێك لە کردار و چالاکیدا ستراکتۆری تایبەت دادەرێژێت وە بەرجەستەی دەکات و لە هەر جێگایەکیش ڕەنگێکی تایبەتی پێدەبەخشێت..ئەوەی لێرەدا پێویستە بوترێت:_لە تەلیسمە گرنگەکانی ڕابردوودا ئەوەی ئێمەی سەرسام کرد چ وزەیەکی ئەفسوناوی توانی بەو فراوانییە میلەتێك بێدەنگ بکات، یان باشتر بڵێم ئەو تەلیسمی بێدەنگیە لە ئاست سیستمی عەقڵی وشۆڕشە جەماوەریەکان چین کە تاسەدەی بیست ویەك کورد هەر زمانی نەبێ، تائەمڕو تاقە نەتەوەیکە بەو ژمارە زۆرەی دانیشتوان وسەروەت وسامانەکەیەوە،خاوەن نیشتمان وزمان وکولتور وزمان وسیستمی سیاسی خۆی نەبێت ،یان بە جۆرێکی تر بەرزبونەوەی تراژیدیا بۆ ئاستێکی بونیادی وسیستمێکی ئاشکراو کۆنکرێتی تەلیسمی سڕبونی زمان تەلیسمی شەڕ نەکردن لەگەڵ کارەساتدا بە وشە ..

باسکردنی من بۆبێدەنگی ئەو بێدەنگیە کەهیچ بێدەنگیەك بەرەو پچرانمان نابات،لەهەر قۆناغێکدا بێدەنگی باڵادەست بێت ئەوا لەو قۆناغەمێژوو بەردەوامی خۆی لەدەست دەدات ...چونکە بێدەنگی بەواتای نەمانی پەیوەندیە لەنێوان ڕۆژەکان و ڕوداوەکان وقۆناغەکاندا.

بەختیارعەلی لەم بارەیەوە دەڵێ:بێدەنگی یان ناخوشبون بریتی نیە لەقسەکردن ونوسین ، بەڵکو بریتیە لەدەستبەرداربوون لەهێزی ووشەو لە دروستکردنی خودادا،وازهێنان لە زمان وەك کەرەستەیەکی عەقڵ وخۆدروستکردن..ئەو ڕۆژەی نەتوانێن تەعبیر لەمرۆ بکەین ئەوساتە وەك ڕۆژ بایەخ و گرنگی قۆناغێك لە ژیانی ئینسانیەت دەدۆڕێنین...کاتێکیش کە ئەمرۆ قسەنەکەین ئەوا لەلیستی ڕۆژەمێرەکەدا نابێنە مێژوو..مێژویەك ڕەنگە تراژیدیای ئەنفال لەساتێك لەساتەوەختی ئەو ڕۆژمێرەوە بە پێتێکی ترو ژمارەیەك لەدەرەوەی ژمارەکانی ترەوە بنوسرێت ئەویش دەقاودەق ل{ئەنفالستانە} گەلی کورد یەکێکە لەومیلەتانە ڕوبەڕێکی درێژو ومێژوویەکی خەجالەتبارمان لەگەڵ بێدەنگی و خامۆشیدا هەیە بەردەوام ئاوڕ لەدواوەی خۆمان دەدەینەوە نەك بەومانایەی ڕابردوو فێرمان بکات ، بەڵکو ئاوردانەوەی گشت قۆناغەکان هەر بۆدواوە ترسێکی گەورەیە ،لە

تازەگەری وکردنەوە بەڕوی جیهاندا چەندین سەدەی دوور ودرێژ وپر لەڕووداو پرسیار وولآم لەبەردەمماندا شەپۆلیان دەدا،چەندین سەدەی تونـاوتون لـە بەردەممانـدا بـێ دەق وبـێ ئاسـەوار،بێ پاشمـاوەی کوژراوەکانمـان.. دەسـەلآت لەنیـشتمانەوە خـامۆش وەستاون ،کە ئاوڕیش دەدەینـەوە بێدەنگی ترسـناکی سالەکان وسەدەکان بەچۆڵی خۆیان پێشوازیمان دەکەن ، ئەوەی کـە لـەو چۆڵە بیابانەوە دەستمان دەکەوێ تـەنها چەند ورتـەورت دەنـگ وهـاواری پچڕپـچڕ قیژەقیـژی نێـو کۆمـەڵی ژن زیـاتر هیـچی تـر نابیستین.کەناشکرێ بەدروست لەناو هاژەو وەحشەتی بێدەنگیـدا ماناکانیان دیاری بکەین ، ئەمەش هیچ یەك لەمێـژوی ئـەورۆژمێرە تۆمارناکات کەئێمە وەك هەر کۆمەڵگایەك دەمانەوێ توماربکەین.

بـەلآم ئـاخۆ بێـدەنگی بـۆ گـەلی کـوردیش لـەناو کولتـورێکی دەولەمەندی دەرودراسێدا چییە؟.

لێـرەوا ئەوەنـدەی پـێم بکـرێ قـسە لەسـەر ئـەم بێـدەنگی وتراژیدیایــە دەکــەم ، یــان ئەوزمانــەی جــەلادبۆ؟ ئــەوهۆکار وئامانجـەی جینۆسـاید وسـەدەی بێـدەنگی وئێـستا لـە کـوێ وەســـتاوە ؟ســـاتەوەختی مرۆڤـــی کـــوردو پەیوەنـــدی بەجیهانەوەچـــیە؟ئەرك ووەزیفـــەی کـــورد لــــەناو ئـــازارە بەردەوامەکانی ئەنفال چییە؟ ئەگەرچـی مـن بۆخـۆم دلنیـام لـەم

سەردەمە ڕۆمانی ئەنفالی گەلی کوردستان بەهەتیوی بێ باوك ودایك تاسالانێکی زۆر دەمێنێتەوە لەوبروایە شدانیم کەس بتوانێ تێکستی ئەنفال بنوسینەوە بەڵام هەرڕۆژێ بێ ئەم ڕۆمانە لەدایك دەبێ!

ئەنفال بۆخۆی ڕوداوێکە لەپێناوی درێژەدان وجوانکردنی مەرگ دروستبووە ولەژێر ئەوبیناگەورانەی شەپۆلی دەنگە دەنگی مردوەکانی کورد تەنها بۆخۆیان ودونیای بێ وێنەو بێکەسی وتەنیای خۆیان ئەدوێن وشەپۆل ئەدەن...شەپۆلێك مەگەر لەسەر روناکی ئاسۆکان تاریکیەکانی ئاشکرابکات..دەنا وزەیەك نابینم لەهیچ شوێنێك ئەوزمانە ئەفسوناوییەی هەبێت....

(لای من گەورەترین گۆڕان لەمێژووی سەر تاسەری کورد ئەوڕۆژە دەست پێدەکات کە دەنگی نەبیستراوی مردوەکانی ئەنفال دەکاتە زمانی زیندوی نوسین وژیان.)

# زمانی ئەنفال‌و بیرکردنەوە لە جیهانێکی دیکە

لەهەرلایەکەوە قسە لەسەر ئەنفال بکەین ناتوانیـت باز بەسـەر هەنـدێ حەقیقـەتی تاڵـدا بـدەیت کەپێوسـتە لـەزمانی ئێمـەوە ئەوڕاستیە بڵێن ودانی پێدابنێن، چونکە دانپیانـان بـەخالیٚ لاوازو شەرمنی خۆمان بەشیکە لـەدەربازبون لەپرۆسـەی ئـەنفال، بۆیـە دەکریٚ وسەیری ئەم ڕوداوە گەورەیە بکەین کەبۆخۆی پـێش هـەر شـتێکی سـەرەتای بیرکردنـەوە لەدونیایـەکی تر،ئـەم کارەسـاتە شـەرعیەتی چـەمکی خۆیمـان پێـدەدات کەهەموسـێبەرو تـاریکی ودەمامکـەکان لابـەین وچـیتر رەحـم بەکـەس نەکـەین بەرامبـەر ڕابـردوی شــەرمن وخەجالــەتباری خۆمان،بــەلای منــەوە لــەدوای ئەنفال ڕابووردو تەنها بەوچاوە سەیر نەکرێت، یان تـەنها قۆناغێـك نیە لەمێژودا کۆمەڵگاش تەنها پێکهاتەیەکی پێکەوە ژیانی کۆمەڵە خەلك نیە،بـەڵکو ڕابـووردوو کومـەڵگاش پێکـەوە قەسابخانەیەکی ترسناك دروستدەکەن، لـەدوایی ئـەم پروسـە جەهەنەمیـە جـەنگ لــەدوای ئــەم پێکهاتــە بالآدەســتەی ئــەمرۆ جــەنگ ، دژی ئــەم چۆنایەتیە...تـەنیا جـەنگ وبیروبۆچـونێك نیـە دژی بـیرو ڕایـەکی دی،بــەڵکو شــەڕ لــەپێناوی ژیــانێکی سەرانــسەریدایە،لەدوای

ئەنفالیش لەوەتێدەگەین کەشەڕ نابێت تەنها لەپێناوی مانەوەدا بێت...بەڵکودەبێت لەپێناوی ماناکانی مانەوەی ژیاندا بێت...مانەوەیەك لەسنوری خراپەکانی بندەستی دەربازی بێت ولەپێناوی سەربەرزی وکەرامەتی ئینساندابێت...چونکە ئەنفالی ئەمرۆش شەڕی ئەمرۆ بەوئاراستەیە دژی ئەکەیت،ئامان پارێزێی لەفەرهەنگی جەلادو قوربانی ، کەس ناتوانێ خودی ژیان بپارێزێت...

کە ئەنفال کرا ساڵەکان هاتن وتێپەڕین پێیان وتین:بۆ ئەوەی تۆش بەو دەردەوە نەبرێیت پێویستە دەستکاری ئەم کولتورە سەقەتە بکەیت ، کەکەسایەتی تۆی بەکوردی شێواندوە،بۆیە دەبێت بەجۆرێکی تر لەمەنتیقی جەلادوقوربانی بدوێین،وەلەدوای ئەوجینۆسایدە بیری مانەوە بکەینەوە ...دەبێ هەمومان لەوڕاستیە تێبگەین وبروابێنین کە ئەنفال کردەوە یەکی مەنتقی بوو.لەساتێك لەساتەکانی میلەتێکی بێدەنگ میگەلی ئاسا دوای قەدەری خۆی کەوت.

ئەگەر ووتمان ئەنفال نامەنتیقیە ودژی مەنتق دەسەلأتی هێزە ئەوەیە کە ئەمانەوێت بڵێین،ئەنفال لەسروشتی ئەوسیستمە تێڕوانینەوە نەهاتووە کەجیهانی ئێمەو جەلادەکانی پێکەوە گرێداوە..ئەمە وێستگەیەکی نابەجێ یە،چونکە ئەنفال بۆخۆی

بەرهەمی کارکردنی سیستمێکە دەرئەنجامی کەڵەکە بوونی کولتورێکە سەدان ساڵە

لەو چوارچێوەیەدا دۆزەخ و ژەهری خۆی دەڕێژێ هەموو داگیرکەرێکی دنیا لەسەر چاوەڕوانی داگیرکراو هەڵوێست وەردەگرێت، سەیری پێشبینی و چاوەڕوانیەکانی کەسی داگیرکراو دەکات ، ئەم داگیرکردنە درێژخایەنەش بۆخۆی شێوازێکی ئاڵۆزتر دروست دەکات،مێژووی مرۆڤی کۆیلە و بندەست مێژووی ترس و قەڵاچۆکردنە ، کۆیلە کەسێکە بەردەوام لە چاوەڕوانی مردندا دەژی ئەم چاوەڕوانیەش ئاستی ترس و ملکەچی بەرجەستە دەکات داگیرکەریش بەردەوام بەدوای ئەوخاڵانەدا دەگەڕێ کە وێنەیەك ڕونتری پێ دەبەخشێت،بەردەوام لەوە دەکۆڵێت کە داگیرکراو لەچی سڵدەکاتەوە بەچی سوجدە دەبات؟چۆن فرمان و ملکەچی قبوڵ دەکات؟داگیرکەرانی کوردوستانیش مانەوەیان و سەرکەوتنیان پەیوەستە بەو وێنەیە کە بۆخۆیان دروستی دەکەن.

ئایا زمان دەتوانێ گوزارشت لە کارەساتێکی وەکو ئەنفال بکات؟ئەی خودی زمانی ئەنفال چی یە؟ئەی ناکرێ ئەو بێدەنگیەی کە ئەنفالی درووست کرد و یان بەرانبەر ئەنفال هەیە

خۆی بچوکی زمان بێت لەبەردەم کارەساتە ترسناکەکاندا؟ئاخۆ تاچەندە زمان دەتوانێ ئەم تراژیدیایە ڕۆشنبکاتەوە؟

بەختیارعەلی ڕۆناکبیری گەلەکەمان دەڵێ:

((زمان ئەو ساتە دەبێتە کەرەسەیەکی خیانەتکار کە ناچێتە ژێرباری وەسفکردنی هەموو مردنەکان ، کە وردەکاری چارەنوسە جیاکان و ڕەنگی دوبارە نەبوەوەی مردوەکان لە ناویەك دیارینەکراوەکەی بەو مانایەی کە وێستگەیەکی گشتیە و هەموان پێیا دەڕۆین،زمان لەم وەسفە سیاسیە بەرینەدا بەرلەوەی ژانی مردوەکانمان پێ پشان بدات ، وێنەیەکی گشتی مردنمان بۆ دەکێشێت وەسفێکی سەرتاسەری دیمەنە ترسناکەکانمان بۆ دەکات،لەپشت ئەو بابەتەشەوە هەموان بەناچاری دەکەوینە قسەکردن....لەسەر پرۆسەی مردنێکی گشتی دەکەوینە دوان لەسەر شتێك کە بەئەنفال ناسراوە)).

بەلای منەوە تواناکانی زمان هێزی نوسین زۆر لەوە بچوکترە ئێستا یەك بەیەك جیهانی مردوو تاریکی مردوەکان ڕۆنبکاتەوە، کێ دەتوانێ چرکەساتێ بەرلە مردنی منالێکی ئەنفال ڕەستەیەکی شایستەی بۆ بنوسێت ، یان هونەری بالای شێوەکار خەتی دەم وچاوی ئەو ئازارانە بکێشێت کە خۆیشی نازانێت کێ

دواڕەنگەكانی دەكێشێ و چۆن دەیكێشێ و بەرەو كام ڕەنگی مردنی خۆی دەبات! ؟كێ دەتوانێ؟!

قسەكردن لەسەر ئەنفال قسەكردنە لەسەر مەرگ،مەرگی دەیان هەزار ئینسان،لەلای منیش ئەوە بۆخۆی مردنێكە بەرلە دایكبونی مردن لەدایك بوە!چونكە سەراپای ڕەنگ و جیاوازی مردنەكان قسەكردنە لەسەر وێنەیەكی مردن.مردنێك بەرلەوەی ئەوان وێنەی بكێشن ئێمە ڕەنگ و شێوازەكانمان بەو بێدنگیە پێشكەشی كردن.وێنەیەك لەدەرەوەی سروشتی مردن بەدۆزەخكردنی مردنێكی دۆزەخیانە .

ڕەهەندی سیحراوی زمان دەبێ وەزیفەی داڕشتنی وێنەی گشتی و داتاشینی وشەی سەرتاسەری لەیەك كاتدا هەبێ وەسفكردنی ژمارەیەكی زۆر لەشی جیاواز بەرابەر بێت...ئەمە خۆی یەكێكە لە ڕەهەندە سیحراویەكانی زمان كە بێ ئەم ڕەهەندە بونی زمانیش مەحاڵە.

بەلام بۆ تابلۆی ئەنفال ئەم زمانە تەواو جیاوازە،هەمو قەڵەمەكان سەپۆلە و سەرسام و سڕدەبن،بێ هێزی زمان لێرەدایە،زمان زۆركات كاركردنەكانی لەسەر وێنە ترسناكەكانی توانای شیكردنەوە و هێڵە گشتی ووێنە گشتیەكانی نییە،كاتێ زمان ئەتوانێ گوزارشت لە ئەنفال بكات كە ئەو وێنە گشتیەمان لا

بسرپێتەوە کەلە لای ئێمە هەموو مردوەکان هەمان وێنەیان هەیە.دەبێ خسوسیەتی هەر مردویەك وێنەیەکی بپارێزرێ و هەموو پیاوکوژەکان بەهەمان شێوە وەسف بکات تابگاتە ئەوڕاستیەی کە بۆچی جەلاد و قوربانی لەبەردەم یەك بێدەنگیدا تەنها پەیوەندی مردن بەیەکیانەوە دەبەستێ،لە ئەنفالدا ڕوبەرێك هەیە دەکەوێتە ئەودیو سنوری گوزارشت کردنەوە و ئەودیوی سنوری زمانەوە،زمان ناتوانێ بگاتە ناوئەزمونی ئەوانەی کە چیتر لە سیمبۆلێکی گشتی مردندا بێت،لێرەشدا خودی زمان لەبەردەم سیحری جەلاد و تواناکانی سەرسام دەبێت،زمانیش بەناچاری باز بەسەر چیرۆکی چارنوسە جیاوازەکاندا دەدات.

دڕندایەتی ئەنفال وا لە مرۆڤ دەکات بڵێ:کە بەرامبەر چەمك وزاراوەی مردن ئەنفال هەیە،کە هیچ مانا و وەسفێکی زمان ناتوانێ ئابلۆقەی بدات و وەسفی بکات.

بەختیار عەلی دەڵێ: لێرە تەنها تەعبیرکردن نییە لە ئەنفال بەلکو جوانیش بۆ شەڕێکی وەها ترسناك و درێو مانای نامێنێت....بەشێوەیەك لە شێوەکانیش بێ مانایە بە جوانی زمان شەڕ لەگەڵ ئەو عەقڵە وەحشیانەیەدا بکەیت کە نەخشەی ئەنفالی کێشاوە ، خۆ ئەگەر بشمانەوێ بە حەقیقەتی ئەنفال بگەین،حەقیقەتی ئەنفال لە ئاشکراکردنی تاڵترە...ئەمەش بەو

مانایە نییە بێدنگی هەڵبـژێرین بـەڵام ئـەنفال دەکەوێتـە ئـەودیوی تەلبەندەکانی زمان و تەعبیرو وەسفەوە.

بەلکو دەبێت ئەنفال لەپشتەوە زمان دوبـارە بۆنـاو جەوهـەری ئاراسـتەی خـۆی بگـەڕێت،دەکرێت لەڕێگـەی ئەنفالـەوە جارێـك ئـەنفال نەکرێت،بـەڵام دەبـێ ئـەنفال زمـانی ڕۆژهـەڵات وەسـف بکاتەوە...

بەختیارعـەلی پـێ وایـە:ئـەنفال ڕابـردو نییـە بەقـەد ئـەوەی تازەنییـەتی تراژیـدیا مـابێ لـەپێش هەموکەسـێکمانەوەیە ڕۆژێـك لەڕۆژەکان دوبارە دەبێتەوە.بەڵام سەبارەت بە بواری تر دەکرێـت ئەنفال کەرەستەیەك بێت بۆ ڕاڤەکردنی جیهانیش.

خۆم بەدرێژایی چەندین سـاڵە دەبیـنم کـار بـۆ ئـەنفال دەکـرێ لەبواری هونەر و ئەدەبدا زۆرم بیست و بـینی نـاوی ئـەنفالیان لـێ نرابـوو، ئەمانـەش بەرهـەمی کەسـانی بێتوانـا و هەنـدێ جـاریش کەسانی نەفام و گەمژە بـون دەسـتیان دەدایـە شـێواندنی ڕۆحـی ئەوپرۆسە گەورەیە...بەشێکی زۆریش لەوانە ویستیان لـە ڕێگـەی کارەسـاتێکی واگـەورەوە..گـەورەیی و شـکۆی بدەنـە نوسـینە سـواوەکانیان یـان هونـەرەکانیان، بـەڵام خۆشـبەختانە ئـەوجۆرە کتێب و ئینشا نوسانە نەچونە ناو کایەی ڕۆشنبیری کوردی و هیچ کاریگـەری لەسـەر خوێنـەری کـورد دانـەنا جگـە لـەخۆ ناشـیرین

کردنـی خۆیـان نـەبێ..لـەم سـاڵانەی دواییـدا خوێنـەری بـاش و نوسەری باش بۆ ئـەم بـوارە دەرکـەوتنو توانیـان ماهیـەتی ئـەو کورتـەباڵا وبەسـتەزمانانە لەسـەر حەقیقـەتی خۆیـان ڕایانگرن و نەتوانن بەئارەزوی خۆیان لوتبەرز بکەنەوەو یاری بە ڕۆحو عەقڵی خوێنەر بکەن.

لەناو ئەم گێژاوە دێرینەدا وێنەی مەرگ شوێنێکی گرنگی داگیر کردوە..لە ئەنفالدا مەرگ دروستکەری قارەمانە ئەوەی دەکوژرێت بـەکوژراوی شـانازییەکی تـر دەخاتـە سـەر شـانازییەکانی ئێمـە ، ئەوە مردوەکانن ئێمە جوانتر دەکەن،وادەکەن بێ مـردن نـەتوانین شانازی بەژیانەوە بکەین...وەك بەختیار دەڵێ:لەم وڵاتە چیرۆکی مەرگ چیرۆکی داستان و قارەمانێتیە، ئـەوە مردوەکـانن ئـیرادەی ئێمە لەسەر بەرگی کۆڵنەدان بەرجەستە دەکەن، بەڵام کاتێك کـە ئـەنفال دێت و وێنـەك دەگۆڕێتـە سـەر وێنەیـەکی تـاڵ.مـردن لـە ئەنفالدا مردنـی تاکـە کەسـی نییە،بـەڵکو مردنـی نەتەوەیەکـە کـە بەبێـدەنگی دەمرێـت..کـە ئـەنفال هـات چیدی وێنـەی نەتـەوەی قارەمان نەما.ئەو وێنەیە نەما کە کوڕەکـانی دەکـوژرێن و هێـشتا تفەنگەکان هەر بەدەستیانەوەیە گوللەی لێنایەتە دەرەوە،ئـەنفال کە هات نەتەوەی مێگـەل و بێـدەنگی لێدەکەوێتەوە،لـەدوای ئـەم کارەساتە چی دی ئەم میلەتە شـانازی بـەجوانی و خودئـەڤینی و

سەرسام بونی خۆی بکاتەوە،لەدوای ئەنفال وێنەی قارەمانی تێکشکاومان لایە،ئەوەش بۆ بەرگریکردن دەستەوەستان مردنێکی زەلیلانە دەمرن مردنێك کە مردنی پێشمەرگە نییە.لەگەڵ ئەنفالدا بەعس و کولتوری عەرەب پێ وتین:مردنی جەنگاوەرانە کۆتایی هات!ئیدی ڕۆژگاری مردنی بەکۆمەڵ دەستی پێکرد،لێرەدا جەنگاوەرێك و منداڵێکی بێدەسەڵات هیچ جیاوازییەکیان نییە،لەگەڵ هەمو ئەمانەشا وێنەی کورد وەك وێنەی نەتەوەیەکی زەلیل پیشان دەدات.کە بەبەرچاوی خۆیەوە هەزارانی لێ ڕاپێچ دەکرێت بۆناو چاڵەکانی مردن،بێ ئەوەی هیچ بڵێ و بە بێدەنگی کۆتایی بە سەردەمی زێڕینی قارەمانەکان دەستپێدەکات.

لە ئەنفالدا مردوەکانمان فریای هیچ نەکەوتن...فریای حسابکردنی مردوەکان نەکەوتن،لە هەموی کارەساتبارتر ئەوەیە کە زیندەکانی وەکو ئێمە ئەو شەرەفەمان بەدەست دەکەوێت کە ئەنفال سەرەتای شەرەفێکە بۆ ئێمە کە لەگەڵ ڕەجعیەتی دەماخسزانەی تاکی کوردی ناگونجێت ، ئیتر چیدی پێویست ناکات کورد ئەوەندە نەزان و گەمژە بێت هەروا بە لوتبەرزی و ئینکاری بە وێنەکانی ڕابردوەوە بنوسێ و شوناسێکی خورافیمان بداتێ کەوا نییە.

لێرەوە ئیتر دێمە ناو جەوهەری پرۆسەکە ئەویش ئەنفالە کە بۆچی ڕۆیدا هۆکارەکانی ئامانجەکانی لەم شرۆڤەیە دەخەینە بەر پرسیار و وڵامدانەوە تا بڕێك لە نهێنی حەقیقەتی تاڵی ئەم ئایەتە بخەینە بەرچاوی خوێنەر ، ئەوەندەش پێمان بکرێ لە باسێکی گشتیدا کۆیاندەکەینەوە هیوادارم خوێنەر پشودرێژ بێت لەگەڵ ئەو چەمك و زاراوە و پەرگرافانەی لێرەدا بەکاری دەهێنین.

بۆئەم مەبەستەش سەرەتادەبێ کار لەبواری سایکۆلۆژی بکەین و پاشان لە سروشتی مرۆڤ و ئەمجار بەرەو دەسەڵات و سیاسەتی دیکتاتۆرانە و بنەما سەرەکیەکانی ڕوداوە دڵتەزێنەکان بخەینە بەرباس و پاشان سروشتی عەرەب و بەعس و بەشێك لە ئایینی عەرەبی و دواجار قسە لەسەر چەمکی جەلاد و قوربانی بکەین و تاوانکاری ڕاستەقینەش لە ڕێگەی نوسینەوە بدەینە دادگا چونکە مێژوو تەنها حوکمی جەلاد نادات لەبەر ئەوەی قوربانیش پشکی ئەم تاوانەی بەر دەکەوێ کە بێ گومان بەلای منەوە تاوانباری سەرەکی لە کۆیلە بون و قڕکردن قوربانیە ئەمجار جەلاد! پاشانیش هەندێ لە ڕوداوەکانی ئەنفال باس دەکەم کە ڕاستەوخۆ ساڵانی هەشتاکان تیایدا ژیاوم وەك کەسێك لە قوربانیەکان .

# سایكۆلۆجیەتی شەڕانگێزیو جینۆسایدی كورد

جەنگ بەمانا تێگەیشتوەكەی،یانی پێكدادانی نێوان تاقمە سیاسیەكانە، یان لەنێوان وڵاتە سەربەخۆكانە،ڕەنگە شەڕەكە جەنگی دیبلۆماسی بێ یان بەزۆر هێنانی ئابوری وپڕۆپاگەندە و یان بەكارهێنانی لەشكر،زۆربەی جەنگەكانیش سەرتا سەرەتایەكی دەرونی هەیە لەسەر بناغەی وروژاندن و خوراندنی دیبلۆماسی و ئابوری شتی تر و تەنانەت شەڕی ئایدیۆلۆژیش.زۆربەی كات شەڕێكی سایكۆلۆژییە پێش وەخت و بۆئەوەی جەنگیش دروست بێ دەبێ سەرەتا دوژمنایەتی لەنێوان ئەو وڵات و هێز و گروپانە دروست بێ.

جەنگیش بە پێی پێناسەی((هۆكۆگرۆتیوس))١٦٤٥-١٥٨٢حاڵەتێكە لە ناكۆكی ئاشتی بەكارهێنانێكی مەجازیە بۆ نشونماكردنی ململانێ و پێشبڕكێ.

بۆنمونە جەنگی وشەكان..جەنگی دەرونی،جەنگی ئیرادە،جەنگی ئیتنی،جەنگی سارد،جەنگی سیاسی و دیبلۆماسی،جەنگی چینایەتی،جەنگی مانەوە،جەنگی نێوان هەردورەگەز،جەنگی نێوان نەتەوەكان،جەنگی دژی

هەژاری،جەنگی دژی نەخۆشی،دژی تاوان،جەنگ دژی خودی جەنگ.

ئەم جەنگانە ئەبێتە هۆی دوژمنایەتی تاك و گروپ بەشێوەیەکی شعوری دەیهێنن،هەندێ جار ڕودەدا و پێشبڕکێ لەسەر دەکرێ.هەندێ کەس وای بۆدەچن کە جەنگ پێویستیەکی سایکۆلۆژیە لەبەر ئەوەی خەمەکان ئەوروژێنێ و لەخەویش ڕاتدەپەڕێنێ و دەبێتە هۆی داهێنانیش و لاوازەکان پێ دەمرن و بەهێزەکان دەمێنەوە کە دەتوانن بەردەوامبن و پەرە بە ژیان و پێشکەوتن بدەن.

-جامبلۆفیس،ڕاتسینهۆنر،تریشکەر،وستانیفس،ارنست رینان لەسەر ئەم بڕوایە بوون...جەنگ لای ئەمانە پاکبونەوەیەکی دەرونی یە و ئەمەش تێوەگلانێکی ئیلاهیە.

بەلام زۆربەی کەسەکان دژی شەڕن چونکە ئاسەوارێکی وێرانکەری هەیە ، وەکو ئەوەی پاکبونەوەی دروست بێ لای ئەمانە:سیسترو،والتر باجوت،یەعقوب نۆفکۆف....مێژوی جەنگەکانیش بە پێنج قۆناغدا تێدەپەڕیوە ئەویش:-شەڕی ئاژەڵەکان شەڕی سەرەتای،شەڕی شارەکان و شەڕی نوێ و شەڕی ئێستا...

شەڕی یەکەم شەڕی حەیوانەکانە، ئەوکاتە لەپێناوی مانەوەی خۆیاندا کە سەرزەویان پڕکردبوو،هەمان ڕەفتاری دوژمنکارانەی حەیوانەکان بەپێ لێکۆڵینەوەی سایکۆلۆژی لە ڕەفتاری مرۆڤدا بەدی دەکرێ.

شەڕی دووەم شەڕی سەرەتای بوو لەپێناوی بردنی مێنەکاندا،یان لەبەرامبەر دەستبەسەراگرتنی (غەنیمە) دەسکەوت..ئەم شەڕانەش بوە هۆی یەککرتنی کۆمەڵی لەو گروپانە کە هاوشێوەی داب و نەریتی یەکتر بون.

کاتێک نوسین دروست بوو گروپەکان بەشێوەیەکی شاری یەکیان دەگرت و شەڕی شار دروست بوو،ئەوەش بوە هۆی دروستکردنی لەشکری پسپۆڕ و ئەمەش بوە هۆکاری سیاسی و ئایدیۆلۆژی و ئایینی هەبوو ئەمەش بوە هۆی سەرهەڵدانی پاڵەوان کە سەردەمی دەگمەن و گەورەبوو لەو سەردەمەدا. لەو سەردەمەدا پێش جەنگی جیهانی یەکەم و دوهەم هەشت جەنگی گەورە لە مێژوی جیهاندا ڕویداوە...هەموو ئەم جەنگانە بەپێ لێکۆڵینەوە سایکۆلوژیەکان هۆکاری سەرەکی دەرونی بوە پێش هەرشتێك ئەمەش نمونەی هۆکاری عرقی یان ڕەگەزی..بۆخۆی بوغزی یەك لەبەرامبە ریەك یان مەیلی مەیلی زاڵبون بەسەر یەکتردا.

-کۆینسی ڕایت،سەرجەم شەڕەکانی مرۆڤایەتی جیهانی تاکاتی شەڕی جیهانی دووهەم بە ٤٧٨ جەنگ خەملاند..١٨٧شەڕ لەنێوان ئەورووپیەکان ڕویدا ٩١شەڕ ئەورووپیەکان دژی گەلانی تر بەرپایان کرد،١٣٥شەڕیش میلەتان بۆ بەدەست هێنانی سەربەخۆی بەرپایان کرد ٧٨جەنگیش لە شەڕی ناوخۆدا لە ئەنجام و هۆکاری ئایدیۆلۆژی داواکردنی ئۆتۆنۆمی و سەربەخۆی روی دا..٦٥جەنگیش بەبانگەشەی ئەوەی پارێزگاری لەشاری سپی پێستەکان دەکەن یان بۆ تەبشیر یان هۆکاری ئاینی.وە لە هەمو شەڕەکاندا کۆدەنگیەك هەیە لەسەر جەنگ کە هەموو هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ حاڵەتی دەرونی، بەجۆرێك لەکاتی سەرهەڵدان یان بەڕێوەبردن ، ئەوانەی بالآیان پێ کردوە کە هۆکارەکەی دەمارگیری و شپرزەیی بون لەجەنگ وەك جۆرج سیمیل،هاردلی،کانتریل،اوتوکلینیسبێرج،فردریکدن،کیش بولرن هەندێکی تر ئەڵێن شەڕ لە تایبەتمەندی زانستی دەرونی سیاسیەوە لەوانە:هارۆلدلاسویل،دەیڤیدرایزمن،ئەناتۆل ڕابوبورت،ڕاینادردویست هەروەها هەندێکی تر لە زانایانی دەرونشیکاری گۆڕانی نوێان کرد...لەوانە:_فرانس الکسندەر،اریك فرۆم،رۆبرتویلدەر.ئەمانەش هەمویان جەختیان لەسەر وتەزای جەنگ کردەوە لەوانە:_دولای.هەست و قوربانی و تێکشکان

کەوتنی بیری ناڕاست لەسەر دەرون ئەم شێوە ناوەیان لەسەر جەنگی جیهانی یەکەم ناونا..شۆکی موشەکەکان(صدمە القذائف) هەمو ئەوانەی بڕیاری شەڕ و وەستانیان هەیە پاڵنەری نەستی لاشعوریش لە گەڵدایە.

جەنگ لە چاکردنەوەی دەروون نزیکبونەوەیەکی لە گەڵ زاراوەی شەڕی دەرونیدا هەیە و شەڕی دەرونی شێوەیەکە کە گروپ و ئینسانەکان لە ڕێگەی پڕۆپاگەندەوە دەست پێدەکات و هەموو شێوەکانی میدیا بەکار دەبات بۆ وروژاندن و دڵتەنگ و شپرزەی بەرامبەر بە دوژمن،بە جنێودان یان بە درۆ بۆ لەتکردنی بڕوا ئیمانی بەرامبەر و لاوازکردنی بەرەی ناوخۆی.

جەنگی دەرونی جەنگی دەرونییە،و جەنگی ئیرادەی،وجەنگ ئاراستەی کەسایەتی شەڕکەر دەکات و ئامانجی گۆڕانی سلۆکێتی بۆ بەدیلکردن یان چۆکدادانی تا زاڵبێت بە سەریا،وشەڕی دەرونی گەورەترین و پیسترین چەکە،ترس،تۆقین،دڵتەنگی و شپرزەیی ویأس و گومان لە کەسدا دروست دەکات وەکو دەردەڕەش وایە.

یەکێ لەو زاراوە و مەترسیانەی کە شەڕی دەرونی پەنای بۆ دەبات شۆردنەوەی مێشکە...غەسل دەماغ،کە ئەوەش مەترسیدارترین چەکە پەنای بۆ دەبرێت.

مەترسیەکانی شەڕی دەرونی لەوەدایە کە شەڕێکی بەردەوامە لە کاتی ئاشتی دا جەنگێکی ساردە و بێ گولە وتۆپ و شمشێر...و جەنگی بیر یان جەنگی ئایدۆلۆژی،ململانێ بیر لەگەڵ بیر دەست پێ دەکات،و ئایدیۆلۆژێکان یەکدەکوژن کەلە کاتی جەنگ و ئاشتی دا شەڕی دەمارگرتنە ، جەنگی ڕاگەیاندن و کەناڵەکانی ئاسمانی و سیاسەت و دیبلۆماسیەتە.شەڕی دەرونی بەرەوپێدانە بەرەو شەڕی بەرجەستەکراو و فعلی.چونکە هەمو مەبەستێکی شەڕ مەبەست خۆبەدەستەوەدانی بەرامبەرە ، چونکە شەڕی نەفسی هەوڵدەدات لە نەیاری بەرامبەر لە دەرونی سیاسی و عەسکەری و مەدەنییەکان تاك و کۆ بۆ لێدان و داغان کردنی ئاستی ورە و تێکدانی کردە و بیر و ئاراستەکان ئەمەش ئەمریکیکان بالآدەست بون تیایدا بونە هۆی ئەوەی یەکێتی سۆڤێت بەبێ جەنگ بێ تەقاندنەوەی فیشەکێك خۆیان بەدەستەوە بدەن لەڕێگەی شەڕی نەفسی دیبلۆماسیەوە.

جەنگی دەرونی دەبێ هێرشی بەرامبەرو بەرگری بێ.شەڕی دەرونی زاراوەیەکی نوێیە بەلآم ناوەڕۆکی ئەم شەڕە کۆنەکان زانیویانە لە تەوراتدا ئەمە بەشێوەی مانا هەبوە هەروەها لە قورئانیشدا بەڕونی دەبینرێ.

ئەم زاراوەیەش بۆ یەکەمین جار لەلایەن،لێکۆڵەرەوەیەکی سەربازی بریگانی بەناوی(فولکر)لەکتێبی(دبابات فی الحرب)تانکەکان لەجەنگدا بکاری هێنا،ئەمەش لە جەنگی یەکەم تۆپەکانیان لەسەر تانکەکان لابرد و(بوقیان لەسەر دانا)بۆ خۆبەدەستەوەدانی دوژمن لەڕێگەی درۆ ڕاگەیاندنەوە،و لەم سەردەمەشدا لەڕێگەی کەناڵی تیکنەلۆجیاوە بە فراوانترین شێوە دەستی پیّ کردەوە.

## سایکۆلۆژیەتی دەمارگیری

زانایانی دەرونشیکاری بەم جۆرە وڵامی هۆکاری دەمارگیری دەدەنەوە:پێش هەمو شتێك هەستکردن لە دەمارگیریدا،گەڕانەوە بۆ پێوەر و داب و قیەم و ئینتماکردن بۆ بەهێزکردنی خۆی،ودەبێتە هۆی ئەوەی خۆی لە پێشبڕكێ دەوروبەردا بەدی بکات بۆ وردکردنەوەی ئەو کەمیە،نەقصی لای خۆی،ودەمارگیری هەمیشە بیرتەسك و زانیاری ڕوکەشیانەی زانیاری و ئەمەش ئەبێتە هۆی تەقینەوەی هێزە دوژمنکارەکانی بۆ ڕونکردنەوەی لەناو گروپەکەی بە شێوەیەکی ئاسان بەم جۆرە ئەبێتە هۆی خورد کردنەوەی دوژمنکاری خۆی بەرامبەر کەمایەتی و ئەمەش

ئەبێتە هۆی بەدەست هێنانی ئینتمای خۆی بۆ گروپەکەی یان خێڵەکەی.

دەمارگیری چەند شێوەیەکە،لەوانە دەمارگیری زمان و دەربڕین یان شێوەی گۆشەگیری ژیانی تاکمەندی و ئستغلال کردن یان بەرجەستە کردنی دوژمنایەتی دژی بەرامبەر و چەوسانەوە یان تەحقیر کردنیان و بێ بەشکردنیان لەڕوی کۆمەڵایەتی و ئیداری و لێدانی جەستە و دەست بەسەراگرتنی سەروەت و سامانیان هەندێ جار بەرەو ئیبادە کردنیان دەچێت.دەمارگیری بە زۆری لەم دوو شێوەیە تەعمیم کراون:

یەکەم:تێڕوانینی یەکەم:بۆ بەرامبەر،کەوا کەسەکانیان لە کافر و مەلعون پێکهاتون دەبێ لەم دونیایە و ئەودونیا ئازار بدرێن وەکو ئەوەی لە عەقڵ و ڕۆحی عەرەبی شوفێنی دەمارگیر دەیانبینین و حەق بە خۆیان دەدەن کە بەرامبەر خۆیان بکوژن چونکە کافرن ، ئەمەش لە مێژوی عروبە لەسەردەمی ئیسلام و پێش ئیسلامەوە تا جروجانەوەرەکانی ئێستا لە سیستەمی فاشی و دەمارگیر و شوفێنیەکانی عەرەب دەبینرێن،هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە سەرەتا بۆ دەمارگیری لایەنی یەکەم،دوهەم بۆجیاوازی نێوان داب و نەریت و شێوەی ژیان ، بەم جۆرەش دەمارگیری لەڕێگەی درۆ و پروپاگەندە بۆ نەیارەکەی گوایە

ئەمانە مێژوی ئینسان دەشێوێنن و تاوانبارن هەروەکو ئەوەی لەم سەردەمەدا لە شاسواری عەرەب صدام حسێن بینیمان چۆن کوردی دەشوبهان بە جەهل و وەحشی و وێرانکەر و کافر.

شێوەی دوهەم:_دەمارگیر وای دەبینێ ، گوایە ئەو جنسە عەقڵی و نەفسی شێواون و نەخۆشن...بۆیە دبێ دوربخرێنەوە لەوشوێنانەی کە گرنگن بۆ ژیان لەوانە لە شوێنی دەوڵەت و شوێنە گرنگەکانی فکر.دەریشکەوتوە لە خەڵکی دەمارگیر هەمیشە لەگەڵ هێزدایە بەڵام چونکە ڕۆژگارێك خۆی لە ئاستی لاوازی وبێ بایەخی خۆی بینیەوە بۆ دژایەتی هەموو دونیا دەکات خۆی تیا دەبینێتەوە بۆیە هەمیشە هەوڵی بەدەستهێنانی زاتی دەمارگیردەکات،لەڕێگەی چەوسانەوەی کەمایەتی و کەسانی دەورویەرەوە.

لەمەیدانی سیاسی و ئاینیشدا..ئاینی ئیسلام نوێنەرەکانی بەشێك بون لەم دەمارگیری و ڕاستیەی کە پرۆسەی ئەنفالی بەرهەم هێنا ، ئەمە سەرەڕای کورد وەك نەتەوە خۆی گوناهی سەرەکی لە ئەستۆدایە ، جگە لەو خیانەت و سازش و تاوانە سیاسیەکانی بزوتنەوەی کوردی کە هاوشێوەی هەمو مێژوی بەعس و ڕاسیزمی عەرەبی گوناهباری یەکەم و دوایین.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم بەشێك لە ڕاسیزمی خێڵەکانی عەرەب لە سەردەمی محمد پێغەمبەری عەرەب بخەمە بەرباس.

## ڕۆڵی ڕاسیزمی خێڵەکانی عەرەب بۆ ئەنفال

ڕاسیزمی عەرەبی دەرئەنجامی دوای سەرهەڵدانی شارستانیەتێك و خود کەشفکردنی نیە لە بەرامبەر ئەوانی تردا،هەڵبژاردنێکی ناچاری ساتی بنیاتنانی پرۆژەی ڕۆشنبیری عەرەبی و دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی نیە،بەڵکو لەدایك بوونی ئەم چەمکە هاوکاتی پرۆژەی عەرەبیە کە هێشتا پرۆژەیەکی خودایيە، هێشتا وێنە خەیاڵیەکانی لە دەقدایە لەوانە (قورئان)کاتێ خودا گەلێك لەگەلان ئەکاتە سەردەستەی ئەوانی دی بارودۆخەکە شێوەیەکی تر لە دەسەلاتی جەبریانە وەردەگرێ و هەمو توخمێکی ئازادی و کەرامەتی ئینسان لێرەوە پێشێل دەکرێت....

بێگومان ئەم بیرۆکەیەش بۆئەوەی ببێتە چەمك و گوتاری گشتی ئێدی پێویستی بە هێزو بنەمایەکی مەعریفی و تیۆری نیە.بەلکو خۆی لەسەر دوو کۆڵەکەی ئەخلاقی ڕادەگرێت ، ئەویش گۆرپینی دەقە وەکو قورەیشیەکان دەیانوت:بۆ گیانێکی پیرۆز.دوهەم:خولقاندنی ئیمانە بەرامبەر دەق و ناواخنەکانی،ئەم

شێوەیە کاتێك دەق دەگۆڕێت بۆ قورئانی پیرۆز دەبێتە خودا و دەبێتە ئیمانێکی دەستەجەمعی،ئیتر لەوێوە پرۆژەی عەرەبی ئیسلام بەهەموو وەهم و گرێ نەستیەکانەوە،چرکەی پێکهاتنی خۆی ڕادەگەیەنێت و تا ئەمڕۆش بەردەوام دەبێت.

دەکرێ مێژوی خوێناوی فتوحاتەکان و چونە دەرەوەی عەرەب لە جەزیرە بە هەنگاوی سەرەکی پێکهاتەی ئەو پرۆژەیە دابنرێت کە نەیتوانی لە جەزیرەدا قۆناغی فۆرمەڵە بونی عەرەبی تەواو بکات بەلکو کاریگەری دەق و ئیمان ئەوەندە کاریگەر بوو کە خێڵە کۆچەرەکانی عەرەب لە سوپایەکی هەلگردا بۆ ئالای خودا ڕێکخستن...کە لە چونە دەرەوەیدا بەر دەوڵەت شارستانیەتەکانی وەکو ئێرانی و بیزەنتی کەوت،کە سەرباری هەرەس و لاوازبونیان لەڕووی سیستەمی دەسەڵاتی ئیداریەوە هێشتا لە شێوازی عەرەبی ئیسلامیدا قۆناغی پێکهاتن و بەهێزبون کە هێشتا قۆناغی ناوەندی بەلکو لە نێوان دەسەڵاتی ئەو ئەمارەتانەدا،کە نوێنەری بەرژەوەندی خێڵ و تایفەکان بون دارشتبون. لە ڕاستیدا ئەوان هەلگری پرۆژەی ڕاستەقینەی عەرەب بون،هەر ئەمیش بوو کە تیۆری توندوتیژی سەرەتایانەی خێڵی بەشێوەیەکی ترسناك تێکەڵی ئەو پرۆژەیە کردووەو دۆزیەوە، کە لەلایەکەوە جەنگەکانی تا ئاستی ئەفسانە ترسناك

بـوون لەلایـەکی تریـشەوە نەیهێـشتوە دەوڵـەتی عـەرەبی لـە پرۆژەیەکی سنووردراردا سەقامگیر بێت،بەلکو دوایی ئەوە هەمیشە هـەڵگرانی ئـەو پرۆژەیـە شـەرعیەتی لـەناودانی ئـەوانی دی بـە خـودایکردنی یـان داوەتـە خۆیـان واتـە ڕاسـیزمی عـەرەبی لـە ئـەنجامی بەرکـەوتن و کەشـفکردنی ئـەوانی دیـەوە پرسـیار لـە ماهیـەتی خـۆی ناکـات بـەلکو شـەڕانگێزی خـۆی بـە تیـۆروانینی سەلەفیانە و سەرچاوەکانی ئیسلامەوە دەبستێتەوە بنەمای خۆی بەناو ئەم پێکهاتـە سـەرەتایانەدا بـەهێزتر دەکات،چونکە هێشتا دونیا لەبەردەم ئەمـدا ئـەو دەروازە داخراوانەدایـە کـە دەبێـت بـە (فتح)بیانکاتەوە ئەمەش لە خۆیـدا ئـەرکێکی خودایـە،بۆ پـرۆژەی ڕۆشنبیری عەرەبی..خـۆی لـەناو پـرۆژەی بـەخودایکردنی دونیـادا دەبینێتەوە،ئەمەش پرۆژەیەکە ڕۆحێکی جیهانی دەخوازێ تیایـدا دین و جەنگ دەبنە هەڵگری یەك ستراتیژ..بەلام مەسیحیەت وەکو دین بـە بەهانـەی بانگەشـەی ئاشـتی وخۆشەویـستی و لێبـوردن و یەکـسانی و برایـەتی نێـوان مـرۆڤ و پـرۆژەی تەبـشیری خـۆی لـەرۆژئاوادا جیادەکاتـەوە، لـەپاڵ بەرزبونـەوەی جـەنگێکی شۆرشـێگرانەتردا کەئیدانـەی سـەرجەم سیـستمی کۆلۆنیـالیزمی رۆژئـاوا دەکـات ودروشمـی لـەنێودانی روتاندنـەوەی گـەلان ولـەناوبردنی کۆیلایـەتی بەرزدەکاتـەوە.بـەلام پـرۆژەی عـەرەبی

جیاوازە چونکە تـەنها لەیـەك دەنـگ وپەیامـەوە دەچێتە دەرێ، ئەویش ئـەرکی تەوحیدە...یەکخستنی دنیـا لەرێگـەی جەنگـەوە هۆکارێکی شەرعی وپیرۆز دەگرێتە ئەستۆ،ستراتیژی ئەم پرۆژەیە کەگەیانـــدن وپــــەیامی خودایــــە، هەرلەهـــــەناوی خۆیــــدا هەموڕەهەنـــدەکانی پێکهێنـــانی دەولـــەتی عـــەرەبی ئیـــسلامی دەبینێتـــەوە...پـــرۆژەی تەوحیـــدیش بـــەخوداییکردنی دونیایـــە ،لەرێگـەی بـەخودایکردنی ئینـسانەوە ..واتـەگۆرینی بونـەوەرێك کەخودا ئامەدەبونێکی هەمیشەیی لەرۆح وجەسـتە وهەسـتەکانیدا هەیە،لێرەوە مـرۆڤ دەبێتـە بونـەوەرێك بۆپەرسـتن خـودا وملکـەچ بوونی بۆ پەیامەکەی ئەمەش واتای ئەوەیە کـە بـون بەپـەیامێکی جیهادی کە خـەبات بۆکۆکردنـەوەی ئینـسانیەت یەکخستنی دنیـا لەسەر بنچینەی عەدلی خودایی ولەژێردەسەڵاتی یەك نەتەوە یـان یــــەك ئومــــەدا ، لەخۆیــــدا شــــوناس وکولتورەکــــانی دی دەشارێتەوە،لەڕاسـتیدا ئەگەرچـی چـەمکی ئوممـە لەئیـسلامدا چــــەمکێکی ئینترناســـیۆنالە وەخـــەونی یەکخـــستنی دونیـــای هەیە،بـەڵام لەهـەمان کاتـدا خـەونی پـرۆژەی عـەرەبی هەیـە، بۆپابەندبونی دەسەڵات وتواندنەوەی شوناسەکانی دی بۆیە بەلای ناسیۆنالیزمەوە تائـەم کاتـە پێکهاتەیـەك هەیـە بـەناوی ئومـەی ئیـسلامی وخودایـەوە کـە عـەرەب هـەڵگری پـەیام وناوەنـدی

دەسەڵاتی کە وەکو دەستەی هەڵبژێراو لەلای خوداو دەسەڵاتی ئەوبەرجەستەدەکات، کاتێك کە ئەلقەی داکشانی دەسەڵات لەدەسەڵاتی ڕەهای خوداوە تیۆ رەیزەدەکرێت بۆدەسەڵاتی پێخەمبەر دواتر خەلیفەکان کە لەلایەکەوە ئەوان نوێنەری پیرۆزی خودان لەسەر زەوی لەلایەکی تریشەوە لەنێوانیاندا پەیمانێکی خۆ نزیکردنەوە لە مەلەکوتی خودایی پیرۆزە..خەلیفەکانیش یەك رەگەزی بنەماڵەیان هەیە کەلەدواجاردا شەجەرەکەشی بەپێغەمبەری کۆتای دێت، ئیدی بەڕمانی دەولەتی عەباسی وسەندنەوەی دەسەڵات لەعەرەب وشکۆمەندی وبالادەستی ئوممەی عەرەبی کۆتای پێدێت ، لەدوایی ئەو ڕوخاندن وتێکشکاندنی دەسەڵاتەوە ناسیۆنالیزمێك کەوەهەمەکانی سەلەف جێناهێلێت ولەساتەوەختێکدا چەمکێکی دەسەڵاتی بەردەست دەکەوێت هەمویان یادەوەریە مێژوییەکانی زیندو دەکاتەوە لەرێگەی سیستمی زمانێکەوە کە هەمیشە جەبری دەسەڵات وسەرکوتکردنی تیادا ئامادەیە کە ئەمەش وادەکات قۆناغی دەسەڵاتی بێ جەنگ تێناپەڕێ .

هیشام جعید لەکتێبەکەیدا دەولەتی ئیسلامی بەسێ قۆناغی پێکهاتەی دەشوبهێنێ:

یەکـەم:ساتەوەختی کـۆچ(هجـره) کەتیایـدا دەسـەڵاتی محمـد دەرکەوت.

دوهەم:لە سالی پێنجەمی کۆچیدا واتـادوایی گـەمارۆی مەدینـە وشەڕی خەنـدەق....کـاتێ ئـەم دەسـەڵاتە وردە وردە خەسلەتە گرنگـەکانی دەولـەتی بەدەسـت هێنـاو هـەموو دورگـەی عـەرەبی گرتەوە.

سـێهەم:_لـەدوایی مردنـی پێغەمبـەرەوە دەسـت پێـدەکات، لەگەڵ دەسەڵاتی ئەبوبەکردا کاتێ دەولەتی ئیسلامی نیشاندا کـە توانای سەرکوتکردنی هەمولادانێکی هەیە بەرێگای هێز.

دوکتۆرهیشام باس لـەوەدەکات گـەرسـیفەتی ئیـسلامی یـاخود بکەینەوە دورتـر نـاوی بنـێن دەولـەتی عـەرەبی ئیـسلامی یـاخود کۆکردنەوەی عەرەب لـەژێر سایەی دەسـەڵاتدا لەهـەر قۆناغێکـدا لەسـتراتیژو شەڕوخۆرێکخـستن لەشـێوەی سـوپادا بەدەرنەبوو،قۆناغی هیجری پێخەمبەر خۆی لەقۆناغێکی تـاکتیکی پاشەکشەیە لەجەنگ، ئەمـە لەکاتێکـدا پـەیامی محمـد کارێگـەری تەواوی بەسەر هەمووخەڵکی جەزیرەوە نیە،لەئاستێکی لاوازدایە.

بەڵام ناکۆکیەکانی نێوان خێلەکان بەکاردەهێنێ بۆ بەهێزکردن وبنیاتنـانی دەسـەڵاتێکی تـر بەرانبـەر دەسـەڵاتی خێڵـدا کەدەسەڵاتێکە هیشتا پێخەمبەر موحەمەد تیایدا نەبوەتە کارێزمـا

بەلکوسەروەری وهێزی کاریزمەی هێشتا نادیارە واتە هـەرئیرادەی خودایە.پەیامی موحەمەد تەقەلای گۆرینی ئینتمای عـەرەبی ئـەدا ...کە لە پەیوەست بون بەخێلی سەرەتاوە پەیوەسـت بـون...بـە خێلێکـی ئـەخلاقی وکولتوریـەوە کەکایـەکی دەمـارگیری نـوێ، تاکەکانی ناوی پەیوەندییەکی رۆحی نادیار واتـا(دیـن) پێکیانـەوە گرێدەدا هەسـتی سـۆز بـەخێزان وعەشـیرەتەوە دەگۆرێـت...بـۆ هەسـتی بـەخودایکردنی ئینـسان لێـرەوە پێخەمبـەر کۆچـەر وئەنسارەکان تێکەڵ دەکا ودەیانکاتە برِوا هاوبەش ئەمـە قۆنـاغی گرنگی بەسیاسیکردنی ئینتمای خێڵـە بـۆ ملکەچـکردنی سـەرجەم خێلەکان وتواندنەوەیان لەپرۆژە خودایدا.

ئەگەرلێرە سەرنجێك بدەین مێـژوی جێگـورکێکردنی دەسـەڵات لەسەرەتای ئیسلامدا ئـەوا دەبیـنین کـەپیرۆزی وپەرستن لـەدوای مـەرگی پێغەمبـەر موحەمـەد کۆتـایی پێدێت،چـیدی هـەمان خودییەتی خودای پێخەمبەری نابێت...بەڵکو لەجێگایەتدا خەلیفە دەبێتە رەمزێـك لـەرەمزەکانی خێـل وسـەرهەڵدانی بزوتنـەوەکانی خـەوارج هەلگەرانـەوەی لەئیـسلامدا وەکێـشە وشـەرِی نێـوان خێلەکان ناکۆکی نێوان خەلیفەکان لەسەر گواستنەوەی دەسەڵات کوشـتنیان لەسـەربەرمالێ نوێـژ بەلگـەن کـەخێل وازی لـەرەمزە دەسەڵات خوازیەکانی خۆی نەهێناوە هەردەم داوای شوێنی خۆی

لەوسیستەمە دەكات ..ئەمەش لەقۆناغێكدایە كەپرۆژەی عـەرەبی
فەتح دەستپێدەكات..ئالەمەڕ رۆشنای ئەم ڕوداوە تێگەیشتنانەوە
ئـــەنفال دەبێتـــە زمـــانی دروشـــم وغەنیمـــە وئیمتـــازاتی خێـــل
كەگەڕانـــەوەی بـــۆ ترســـناكترین شـــێوەی شـــەڕ وپـــەلاماردانی
سەرەتاییانە كەلەڕاستیدا لێرەوە پـرۆژەی سەردەستی عـەرەبی
لەگەیانـــدنی پەیامـــە ئـــەخلاقێكان پـــەیامیش پاشـــگەز
دەبێتەوە،پەلهاویشتنی ئەوخێلـە رێكخراوانـە لەسوپای عـەرەبی
ئیـسلامدا كـەدواتر دەولـەتێكی عـەرەبی قەبـەلی لەسەربنـچینەی
غەنیمـــــەو دەســــــتكەوتە فراوانـــــەكانی خێـــــلّ دروســـــت
دەكات...كەئەمەش ئاكارێكی فاشیانە بۆخێل بـەرەلآدەكات كـە
لەبەدەســــــتهێنانی زورتـــــرین دەســــــتكەوتدا ئەوئیلهامـــــە
كەناسیۆنالیزمی عەرەبی بونیادی خۆی لەسەردەنێتەوە بەلآم ئەم
ناسیۆنالیزمە هەرچەندە ڕاگیربوونی دەولەتی هاوچەرخانەی خۆی
لەناو ڕوحی نەتەوە لەدەرەوەی دەولەتی خێلدا دەبینێتەوە بـەلآم
لەڕاسـتیدا سروشـتی خـۆی لەهـەمان چـەمكە سـود لەخێلـەكان
وەردەگرێت وە لەهەمان پرۆژەدا خەون دەبینێت بێگومـان ئەمـە
پالپشتی كەلەپورێكە لەفیكری ناعەقلانیەی هاوچەرخدا.

چەمكی ناسیۆنالیزمی فەرهەنگی وجیهانگیری وەكو پانتایـەكی
كولتـــوری وكـــراوە وەكـــو بانگەشـــەیەكی عـــەقلآنی لـــەكردەی

پراکتیزەکردنی گۆڕینی بۆناسیۆنالیزمی سیاسیدا ستیۆلیزاو بزربوو،پەیامە عەقلانیکەی خۆی لەدەستدا کاتێك ئەم چەمکە لەفەلسەفەوە گۆڕا بۆ ئایدۆلۆژیای سیاسی وئەوپەیامەش لەدەست رۆشنبیرو فەیلەسوفەکان سەندرایەوە سیاسیەکان گرتیانەدەست ئیدی بوە بزوتنەوەیەکی شەڕانگێز وتۆڵەخواز کەتەقەلای جیهانگەرای بەجەنگ سەپاند.

فاشیزمی عەرەبی بنچینەی ئەفسانەی خۆی لەپرۆژەیەکی غەیبانی جیهانگەراوە کە لەغەیبەوە بۆی دابەزیوە لەکولتوری سەلەفی ناعەقلانیەوە لەدەقەوە چەمکەکانی وەرگرتوە هەڵهێنجاوە، جەوهەری ئەم ئەفسانەش مانیفێستی سەرەکی جولانەوەی ناسیۆنالیزمی عەرەبی هاوچەرخ کە بەعسێکان وحزبەکەیان،دیارترین نمونەیەتی وهەڵگری لایەنە عەمەلییەکەیەتی ئەو دروشمەش پەیامی نەمرو رسالە خالدە وئوممەی یەککگرتوو..کە ئەمە لەساتەوەختی خستنەڕۆی پرۆژەی عەرەبیدا دەستپێدەکات ولە قۆناغێکدا شکست دێنێ ودەبێتە جۆرێك لە وەهم وئەفسانە وناسیۆنالیزمی نوێی عەرەبی ، بەچەمك وخوازراوەکانی فاشیزم هەناسەی بەبەردا دەکاتەوە بەعسیش خۆی مانای زمانی جەلاد لەساتەوەختی بێدەنگی زمانی

قوربانێکـان و مانـای خـود ژیانەوەیـە لەمێـژودا بەسـەرتاپای ئەزمونی تیۆرەکانیەوە.

بەرلـەوەی بـچینەوە سـەر فاشـیزم وبەعـسیزم بـە پێویـستی دەزانم سەرەتا لەسەر جینۆساید ڕاوەستم وقسەی لەسـەر بکـەم وئەمجار دێمە ناو بەشەکانی ئەم ڕاڤەیـە تـا لەبنـچینەوە هۆکـاری سـەرەکێکانی ئـەم پرۆسـەیە بۆخۆێنـەری کـوردی ئاشـکراکەم وە هەروەها کارێگەری گەڕان وپشکنین بەناو چەمك وزاراوەکان بڕێـك لەو تاوانە بخەینە ئەستۆی دەرەوەی بـەعس کەپرۆسـەی ئـەنفال بەتـەنها بـەعس لـێ بەرپرسـیار نیـە بـەلکو پرۆسـەی ئـەنفال درێژەپێـدانی تێـز وجولانـەوەکانی ڕابـردوی مرۆڤایەتیـە دەسـت بەدەسـت گـوازراو نەتـەوە بـۆ دورگـەی سارانـشین وحوشـتر لەوانـەکانی عروبـە تادەگاتـە لای سـەرەك خێڵـەکانی کـورد کـە لەبەرگی حزبی قەومی ئایدۆلۆژیادا کاری لەسەر دەکەن.

## ئەنفال وجینۆساید

جینۆساید وشەیەکی نـوێ یـە بـەتاوانێکی دێـرین، بریارنامـەی نەتەوە یـەکگرتوەکان بـەمجۆرە دەسـتپێدەکات کـە بۆ یەکـەمین جار یاساناسی پۆلۆنی (رافایل لیمکین) لەسالی ١٩٤٤ لەکتێبێکدا

به ناوی یاسای میحوەری لەداگیرکردنی ئەوروپا ئەم وشـەیەی بە کارهێنـــاوە تـــا ئەوکاتـــە ئـــەم وشـــەیە لـــە هـــیچ فەرهـــەنگ وئینسکلۆپێدیایەکدا نەبووە هەرخۆشی داهێنەری ئەم تێرمەیە کە لێکـراس پێـشگری یۆنـاس (بـە مانـای نەتـەوە،خێڵ..تایفـە) وە پاشگری لاتینی بەمانای کوشـتن دایتاشـیوە، جینۆسـاید بـەمانای لـەناوبردنی بـە ئەنقەسـتی هـەمویان بەشـێکی کەمایەتیـەکی ڕەگـەزی..ئـاینی..تـایفی..ئیـتنی یـان سیاسـی دێـت لەلایـەن حکومەتەوە یـان دام ودەزگـای پیاوەکانیـەوە..هـەروەها کوشـتن بەکۆمـەڵ ناگرێتەوە،بـەلکو برسـی کـردن وبـەزۆر ڕاگـوێزان ودەستبەسـەرکردن (حجـزی) سیاسـی ئـاوبوری و بایـەلۆجیش دەگەڕێتەوە.

جینۆساید تاوانێکی هەمەلایەنەیە دەکرێ یـەکجۆری پراکتیـك بکرێت وەکو نەهێشتنی بەدەنی،دەشـکرێ هەمـە جۆربێـت وەکـو جینۆسایدی کـەلتوری نەتـەوەی، بیۆلـۆژی ئـابوری، لەهـەمو ئـەم حالەتانەشـدا ئـەم تاوانـە تـاوانێکی سـەربەخۆیەو لێپرسـینەوەی نێونەتەوەی لێدەکەوتیەوە ئەستۆی تاوانکاری.

چەمکی جینوساید لـەرووی زمانـەوە لـەدوو وشـەپێك دێ واتـە ڕەگـەز بنەچـە دوهـەم واتەکوشـتن وفەوتانـدن..بەلێکدانـەوەی هەردوکیشیان فەوتاندنی بنەچە دێ.

جــاك نوســـان پوتـــەر دەستنيــشانى ئــەوەمان بۆدەكــات كەجينۆســايد ســێ ڕەگــەزى ســەرەكى لــەخۆى دەگرێت،ئــەويش ئايدۆلۆژيا تەكنەلۆجى وبيروكراسى دام ودەزگا.

١_ئايـدۆلۆژيا: جـەلاد بـۆ لـەناوبردنى قوربانێكـەى بـەكاردێنێ وەكليلـى كـردەى جينۆســايد لــە ئايـدۆلۆژياش بـەزۆرى لەســەر زەمينەيەكى ڕەگەزپەرستانە يان ئاينيەوە دێتەكايەوە، شەرعيەت بەهەركردەوەيـــەك دەدات چـــەند دڕندانـــەش بێـــت ، ئـــەو پروپاگەندەيەش كە بۆ بلاوكرنەوەى ئايدۆلۆژيا دەكرێت وێنەيەكى وا نامرۆڤانە دەبەخشيتە قوربانێكان كە پەلامادران ولەناو بردنيان ئاسانە بـەلكو حـەلالَ دەبێـت.. هـەروەها وشـەگەلى وەكـو كـافرو تێكدەر،لادەر خيانەتكار،جاهيل دواكەوتوو...كـە واتـە ئايـدۆلۆژيا شەرعيەت دەبەخشيتە جەلاد بۆجێ بەجێكردنى تاوانەكەى.

هەرلەم ڕوانگەيەوە ئەرمەنيە مەسيحێكان لەلايەن كورد وتوركە موسلمانەكانەوە بە نەزان ودەبەنگ يان كـافر بـراون، لـەوەش پـڕ مەترسيتر وەك مەڕێك سەيركراون كە سەربڕين وكوشتنيان حەلاڵـە هەرهـــەمان دەســـتەواژە مـــۆتيفى جينۆســـايد كردنـــى جولەكـــە وقەرەجەكانيش لەلايەن نازيەكانەوە.

لەجەنگی جیهانی دوهەمدا ئایدۆلۆژیای ڕاسستی نازیزم کە خەڵکی ئەڵمان بەخاوەن شوناسێکی ڕون وئاشکرا دادەنێت کە لەسەر بنچینەی خوێن پێکهاتوە، جولەکە وقەرەج وهۆسیکشۆلەکان ئەوانەی لەگەڵ هاوسیکسی خۆیان جووت دەبن...واتە ژن لەگەڵ ژن وپیاو لەگەڵ پیاو بەنامرۆڤ دیاری دەکات، ئەوانەی بەڕەسمی بەشێك لە فۆلك بون بەلکو غەریبن کەسەر بەڕەگەزی بەشەرنەبون لەکاتێك ئەڵمان سەر بەگەورەترین وپایەبلندترین ڕەگەزی ئاریای بووە،بۆیە دەبوو بۆپاککردنەوەی ڕەگەزی ئاریای پاراستنی فۆلکی ئەڵمانی هەمو لە ناوببرێن،ئایدۆلۆژیا لەسەربنچینەی ڕاسیزم و فۆرمەلە نوییەی هێلین فاین وەسف دەکات دامەزراوە، مەرجی سەرەکی وجەوهەری جینۆسایدە، ئەو ئایدۆلۆژیایە قوربانی ڕیسوادەکات ودایدە برێت لەکاتێکدا جەلادەکان لە کردەوە وڕاوەدنانە جینۆسایدیەکاندا مۆبیل دەکات.

٢_تەکنەلۆجیا لەم سەردەمەدا یەکێکە لەڕەگەزە ئاشکراکانی جینۆسایدە لە کاتێکا دەولەتی نەتەوە مۆدێرنەکان هەرچی زیاتر بواری تەکنەلۆجیادا پێشدەکەون هەرچی تەکنەلۆجیای مەرگە کاریگەرتردەبێت، لەکاتێکدا لەجینۆسایدە کۆنەکاندا بیروڕای تر بەکارهاتوە بەڵام لەسەردەمی ئێستادا تەکنەلۆژیا کوشندەترین

چەمکی جینۆسایدە...هەروەکو چەکی کیمیاوی دژی خەڵکی هەڵەبجە..ژوری گازەکانی نازیەکان.

٣_بیروکراسی لە بەڕێوەبردنی جینۆسایدا ڕۆلێکی گرنگ دەبینێ چونکە جنیۆسایدپێویستی بەکۆمەلێك دام ودەزگای چالاك دەبێت بۆ ئۆرگانیزەکردن ،چونکە خورێکخستن و بەڕێوەبردنی سیستماتیکیانەی ئەوگروپە سەربازی ومەدەنی وجیاجیاکان گواستنەوە وریکاوبانەکان گرنگیەکی گەورەی هەیە لەپرۆسەی جینۆسایدکردندا.

لە مێژوی کۆی جینۆسایدا شێوازەکانی عەفەوی بوە ڕۆلی خۆی بینیوە ، هەروەها بەزۆری ڕق و کینی ئاینی داینەمۆی شەڕ و کوشتارە خوێناویەکان بووە، پرۆسەی قڕکردنی دوژمن بووە بەلام لە ئێستادا جینۆسایدی مۆدێرن کوشەندەترینیانە بەهۆی ئالۆزی پێشکەوتنی تەکنۆلۆجیاوە،ئەمەش زیاتر پێویستی بە مەهارەتی لۆژیك و ئۆرگانیزەکراو دەبێت..بە جینۆسایدی بەئەنقەستیش پلان بۆ دانراوی مۆدێرن دەبێت،لەیەکەم هەنگاودا وەك تاوانێکی ئۆرگانیزەکرای دەوڵەت بناسرێت و تاوانی واش لەیەك کاتدا پێویستی بە بیرۆکراسیەتێکی زۆر ئالۆز دەبێت جینۆساید بەپێی بڕیارنامەی نەتەوە یەکگرتوەکان لەساڵی ١٩٤٨لە مادەی دەهەمی بەیاننامەکەدا بەمانای هەریەکێك لەم

کردوه و پرۆسانەی خوارەوە دێت کە بە ئەنقەست و مەبەستەوە ئـەنجام درابێـت بـۆ لـەناوبرنی هـەمو یـان بەشـێکی گروپێکـی نەتەوەی..ئێتنی..ئاینی..ڕەگەزی.

١_کوشتنی ئەندامانی گروپەکە.

٢_گەیاندنی ئازار و زیانی گەورەی جەستەیی یان دەرونـی بـە ئەندامانی گروپەکە.

٣_بەو مەبەستەی ببێتە هۆی داڕمان و تێکدانی فیزیکی.هـەمو یان بەشێکی ئەو گروپە.

٤_سـەپاندنی هەنـدێك ئیجرائـات بەمەبەسـتی ڕێگـەگرتن لـە منداڵبون لەناو گروپەکەدا.

٥_بەزۆر ڕاگواستنی منداڵانی گروپەکە بۆلای گروپێکی تر.

ئەم تاوانە پێشێلکردنێکی تەواوی مافی مرۆڤـە بەتایبـەتیش زۆر ترسناکە لە دژی ماف یان تێکدەری ئاشتی وئاسایش نێونەتـەویی بۆیە بڕیاری ئەوەی لەسەر دراوە کـە تاوانـائێکی دڕندەیـە لـە دژی مرۆڤایـەتی.تـاوان دژی مرۆڤایـەتیش هاوشـانی تـاوانی جـەنگ و تاوانی دژی ئاشتی بە تاوانی نێونەتەوەیی دەژمێردرێن.

لـــەدوای جـــەنگی جیهـــانی یەکەمـــەوە بـــەهۆی تـــاوانی فاشیستەکانەوە لە یاسای تازەی نێودەوڵەتاندا ئەو پرەنسیپە بـە تـەواوی جێگیربـوو کـە جینۆسـاید تـاوانێکی دڕندانەیـە لـە دژی

مرۆڤایەتی، بۆیە نەك هەر وڵاتانی تاوانکار بەڵکو ئەو کەسانەش کە بە ئەنجامدانی جینۆساید تاوابار دەکرێن لێپرسینەوەی یاسای نێوەنەتەوەیی دەکەوێتە ئەستۆیان.

کۆمەڵەی گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان پشتی بەبەندی شەشەمی دەستوری دادگای نۆرنبێرگ دەبەستێ کە جینۆساید واتە پەرتکردنەوەی مافی بوونی سەرجەمی کۆمەڵەی مرۆڤایەتی هەروەکو چۆن فەوتاندنی مرۆڤ نیشانەی ڕەتکردنەوەی مافی بوونی ژیانە ئەویش ڕەفزکردنەوەی دانپێدانانە بەمافی بوون،سوکایەتی کردنە بە سەرجەم مرۆڤایەتی و ژیانێکی قەرەبوونە بووە و دروست دەکات،سەرجەمی کولتوری شارستانی کۆمەڵی مرۆڤ دادەماڵێ و دژی یاسای ڕەوشت و ناوەڕۆك و مەبەستی نەتەوە یەکگرتوەکان ڕادەوەستێ.

تاوانی جینۆساید لە هەمو سەردەمێکی مرۆڤایەتیدا ئامادە بووە،بەڵام پێش سەردەمی ئێستامان بەدەگمەن نەبێت هەمیشە لایەنێك بووە لە جەنگ یاخود لە سەدی شانزەهەم و نۆزدەهەمدا لایەنێك بووە،لە لایەنەکانی پێشکەوتن و گەشەکردنی، هەروەها جینۆساید بەسەردەمێکی دیاری کراودا دەردەکەوێت،فتوحات چەوسانەوەی ئایینی،دەست بەسەراگرتنی وداگیرکردنی کۆلۆنیالی،بەڵام لە سەدەی بیستەمدا جینۆساید بوەتە ڕوداوێکی

زۆر بــاو زیــاتر لەمــەش شــێوە جیاجیاکــانی وەرگرتوە،لــەم ســەردەمەی خۆشمانــدا بوەتــە خــاڵی یەکگرتنــەوەی هێــزە تێکــدەرەکان لــەم ڕوەشــەوە تــەنها شــارەزایانی جینۆســاید چوارجۆری جینۆساید دیاری دەکەن.

١_دوور خستنەوە و نەهێشتنی هەڕەشە و مەترسی دوژمن یان گروپی بەرانبەر.

٢_ئەنجامدانی تیرۆر و تۆقاندن.

٣_دەست بەسەرا گرتنی سامانی ئابوری.

٤.ســەپاندنی باوەڕێــك یــان تیۆرێــك یــا ئایدیۆلۆژیایــەك بــە زۆر.دواتریش پەیماننامەی قدەغە کردنی جینۆسایدی سەرخستە ســەر تاوانکــارانی لــە ١٩٤٨\١٢\٩دا ڕێکخــراوی نەتــەوە یــەکگرتوەکان(ر.ن.ی)تایبــەت کــرا بــەو تاوانــە نێونەتەوەییە،پرۆسـەی دانـانی ئـەو بەڵگەنامانـە جیهانیـە لەگـەڵ سەرچاوە باس کراوە.

بنەماکانی مـەحکوم کردنـی جینۆسـاید وەك تـاوانێکی دڕندانـە لـەدژی مرۆڤایـەتی خەسـلەتێکی باڵایـان هەیـە بۆیـە بەسـەر ئـەو وڵاتانەش دەکرێتە مەرج دەسەپێنرێت کە بەژدار نین لە بەیاننامـە ١٩٤٨ی قەدەغـە کردنـی جینۆسـایدا، لـەو بارەیـەوە پـشتگیری یاساناسی(یو.ئە.یشتیەف)دەکرێ کـە پێوایە،بەرهەڵستی کردنـی

تـاوانی جینۆسـاید لـه بنـهما باڵاكـانی یاسـای نێودەوڵەتانـەوە هەڵـدەگرێ كـه مەرجـه بـه هـەموو وڵاتێـك بـه بێرەچـاوكردنی بەشـداری نـەكردنیان لـه پەیماننامـەی ١٩٤٨دا دەربـارەی قەدەغەكردنی جینۆساید وسزاخستنه سەر تاوانكارانی.

هـەر لـەو بارەیەشـەوە دادگـای نێودەوڵەتی،ر،ن،ی،له ٢٨\٥\١٩٥١دا ڕایگەیاند كە(هۆی دانانی ئەو پەیماننامەیە مەبەستی ناوبراوە كـه جینۆسـاید مـەحكوم بكـا و سـزای بخاتـه سـەر وەك تاوانێـك لـه یاسـای نێودەوڵەتاندا،ئـەم تیـۆرەش دەگاتـە ئـەو ئەنجامـەی كـه ئـەو پرەنـسیپانەی پەیمانەكـەیان لەسـەر بنیـات نراوە،بـریتین لـەو پرەنـسیپەدان پێدانراوانـەی كـه میلـەتانی پێشكەوتوو دەیكەنـه مـەرج بەسـەر تەنانەت ئەو وڵاتانەشەوە كە پەیوەنددار نین به پەیماننامەكەوە.

بەندی١٩ی پرۆژە یاسـای بەرپرسـیارێتی دەوڵـەت كـه لیژنـەی یاسای نێودەوڵەتان لـه(ر.ن.ی.)داینـاوە ئـەوە دیـاری دەكـات لـه یاسـای تـازەی نێودەوڵەتانـدا هـەر ڕەفتـارێكی دەوڵـەت كـه پابەندێتی نێونەتەوەیی بـشكێنێ...ئـەوە ڕەفتـارێكی جیهـانین دژ بـەو یاسـایە ئـەم پابەندێتیـە نێونەتەوەیـەش سەرچـاوەكەی داب ونەریتـەوە یـا لەڕێكەوتننامـەوە بێت،شـكاندنی كـار ناكاتـه سـەر بەرپرسیارێتی نەتـەوەیی كـه ڕەفتـاری دژبەیاسـای ئـەو دەوڵەتـه

هێناویەتە ئاراوە، کەواتە ئەو پابەندێتیە نێونەتەوەیە کە دەوڵەت هەیەتی ئەگەر سەرچاوەکەی لە داب و نەریتی نێودەوڵەتیەوە بێت،یا لە ڕێکەوتننامە و ئەوە شکاندنی دژەکارە لە یاسای نێودەوڵەتاندا بۆیە لێپرسینەوە لەسەری کارێکی حەتمیە،ئەمەش زیاتر هەمان بیرورا دەچەسپێ کە دەوڵەت بەشداریش نەبێ لەو بەیاننامەی کە تایبەت کراوە بە قەدەغەکردنی جینۆسایدەوە،ئەوە هەر بەرپرسیارێتی نێونەتەوەیی لە ئەستۆدایە دەبێ پێوەی پابەند بێ.

جینۆساید بەتەنیا فەوتاندنی فیزیکی کۆمەڵەخەڵکێکی نەتەوەی کە ئێشێکی ڕەگەزی یان ئاینی نییە بەڵکە چەند جۆرێکە.

١_جینۆسایدی فیزیکی(بەدەنی)جەستەیی بە هەرجۆرێك بێ،ئیعدام کردن،گولەباران کردن،هێرشی سەربازی و بەکۆمەڵ کوشتن،بەکارهێنانی چەکی قڕکردن،وەکو کیمیاوی و فسفۆری و...هتد...

٢_جینۆسایدی بیۆلۆژی،بەربەنکردنی هەرکۆمەڵە مرۆڤێك لە پێشکەوتن و زیادبون وەکو بەربەندکردنی منالبون زیادکردن یا لە یەك دابڕینی پیاو وئافرەت دابەشکردنی کەسانی خێزانی بۆ ماوەیەکی زۆر،ئەم جۆرە جینۆسایدەش کە هێرشەکانی

ئەنفالی١٩٨٨پەیڕەو کراوە بەتایبەتی دابڕینی پیاوان لە ئافرەتـان و دابڕینی کچان لە دایکان و باوکان و دوایش منالآن لە دایکان.

٣_جینۆسایدی کولتوری،نەتەوەیی،وەکو قەدەغەکردنی زمـان و ڕۆشنبیری و شێواندنی مێژو،فەوتاندنی تایبەتمەنـدی نەتـەوەیی نەهێشتنی یـەکێتی هاوبەشـی نێـوان خەڵك،هـەروەها وێرانکردنـی شـوێنەوارە دێرینـەکان وەکـو ڕوخانـدنی پەیکـەر و ئەشـکەوت و مـۆزە و گـەڕەك و گـەرماو وبـازار و مزگـەوت و کلیـسە و هـەموو شوێنەوارێك کە پاشماوەی کۆن یان نوێ بێـت و بەرهـەمی جـۆری ژیانی ئەو خەڵکە بێت.

٤_جینۆسایدی ئابوری..پێ دەوترێ وێرانکردنـی ئـابوری واتـە وێرانکردنـی سـامان و سروشـت و بـەروبومی ناوچـەکان،هەروەها تاڵان کردن و فـەرهودکردنی سـەروەت و سـامانی خەڵك،گەمارۆی ئابوری بەمەبەستی برسی کردنی خـەڵك، ئەمانـە هـەمویان دەبنـە هۆی فەوتاندنی لەسەرخۆی مـرۆڤ جگـە لـەوەی ڕێـژەی مـردن بـە هـۆی نـەبوونی خـۆراکی پێویـست داوودەرمـان و زیـادبونی نەخۆشیەوە زیاد دەکات وە دەبێتە هۆی کۆچکردنی بەکۆمەڵ کە ئەنجامەکـەی چـۆڵکردنی شـوێنی باوبـاپیران و شـوێنی ڕەسـەنی خۆیـان، ئەمـەش زۆرجـار دەبێتـە هـۆی پەرتـەوازەکردنی لـە دەسـتدانی داب ونـەریتی کۆمەڵایـەتی و فەوتانـدنی کولتـوری

نەتەوەیی.بەعسیەکان جیاواز لە ئەنفالی بە ناو فتوحاتەکانی سەرەتاکانی ئیسلام وسەردەمی دابەزینی قورئان و پاشانیش نوسینەوەی لە سەردەمی خەلیفەکاندا،تاڕادەیەکیش جیاوازە لە هێرشی سەردەمی خولەفاکان بۆ سەر میلەتانی تری ناوچەکە.

ئەگەرچی ئەنفال و جینۆساید پەیوەندیەکی ڕاستە وخۆی بەیەکەوە هەیە بەڵام دوو چەمکی جیاوازن ئەنفال بەمانای تاڵانی و قڕکردن دی،کێشەیەکە لە کاتی جەنگدا دێتە پێش لەگەڵ ئەوەشدا ئەنفال بەشێکی دانەبڕاوە لە جینۆساید و بەهەموو پێوانەکان دەچێتە خانەی تاوانی جینۆسایدەوە کە بەتاوانی نێونەتەوەی دژمێردرێت .بە پێ ئەوە دەرەنجام و وزەیفەی بەرجەستەی دەکات..هەروەها تاڵانکردنیش لەلایەن قورئانەوە ڕێگەی پێدراوە بەپێ شەریعەت ،ئەمەش بەوکەسانە یەخشراوە کە لەپێناوی ئاینی ئیسلامدا شەڕدەکەن،ئەمەش لەپێناوی پاراستن وپەرەپێدان وبلأوکردنەوەی ئیسلام.

کاتێک ئاینی ئیسلام غەنیمە حەلاڵ دەکات ئیماندارەکان هەرچی زیاتر هاندەدرێن بۆپەلەماردان، چونکە تاڵانی بۆخۆی تەماحێکی گەورەیە لەبەردەم مرۆڤدا، بۆهەرچی زیاتر دڕاندایەتی کردن..لەئاینی ئیسلامدا ئایەتی ئەنفال بەئاشکرادان بە حەلاڵ کردنی غەنیمەدادەنێت ،لەکۆتای هەفتاکان وسەرەتای

هەشتاکاندا ئیدی زۆر بەئاشکرا بەعس هەوڵیداوە ئەوبەرگە ئاینیەبپۆشێت،ئەمە یەکێك بوە لە تاکتیکە هەرەکاریکەرەگانی...بەڵکو لەسەرەتاوە بەعس لە ئایدۆلۆژیای سیاسیدا حسابی جدی بۆ ئەوڕەهەندە ئاینیەکردووە.

لە کۆتاییەکانی سەدەی شەشەمی زاینیدا پێغەمبەری موسوڵمانان باش لەوە تێگەیشتبوو کە خێڵەکەی ڕێگەیەکی خراپیانگرتوەتەبەر،بۆگۆرینی ئەو دۆخەش پێویستیان بە ئایدۆلۆژیایەك هەبوو تاگورێکی دی بدەنەوە بەژیان وشێوازی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیکان دیاری بکەن،چونکە ئەوەی دیارە هەرسێ ئاینە تەوحیدێکە لەسەرەتاوە هەتاوی بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی کێشەی چینەچەوساوەکان بوون.بەڵام کاتێ بون بە نوخبەی ئایدۆلۆژیای دەسەڵاتدار، ئەوانیش دەسەڵاتەکەیان لەدژی خەڵك بەکارهێناوە،بۆیە پاشتر جوڵانەوەی نەتەوایەتی ومیلیشیاکان دژی دەسەڵاتی ئاینی دەوەستنەوە،مەسیحیەت لە زمانی مەسیحیەتی خۆیدا پاشانیش لەسەرەتای ئاینی بڵاوبونەوەیدا ، یەهودی وسەرکردەکانی ئیمبراتۆریەتی ڕۆمانی،دواتریش کە بەشێوەیەکی فراوان بڵاودەبێتەوە پاپاویەت سەرهەڵدەدات بۆ ئەوەی دەسەڵاتی سەرتاسەری ئاینی زاڵبکات وە سنورێك بۆپاشاو ئەمیرەکان دابنێت،بەکاریان بهێنی بۆ

مەرامی دەسەڵاتە ئاینییەکەی، بەڵام لەگەڵ سەرهەڵدانی کاتۆلیکدا دەست دەداتە دەستی فیودالەکانو لەویۆە دبێتە دەزگایەکی داپلۆسێنەری جوتیاران وهەژارانی چەوساوە هەر بۆیەش هەستی نەتەوایەتی دژی دەسەلاتی ئاینی پەرەدەستێنێ وە دوای ئەوە پاپاویەت هێدی هێدی پاشکشە دەکات.

ئەراگۆن دەڵێت: محمد وەك مەسیح بەرەوڕوی دەسەلاتێکی بەهێزی وەك ئیمبراتۆریەتی ڕۆمانی نەبووە و بەلکو دەبوو سیستمێکی سیاسی نۆی بهێنێتەکایەوە کە لەسەر سێمبولیزمێکی ئاینی نۆی بەندبێت.

خەونی پێخەمبەر خەونی ئیمبراتۆریەتێکی عەرەبی بوو، چونکە خێڵەکانی عەرەب لەوسەردەمەدا پەرش وبلاوبون لەولاشەوە بەدوو ئیمبراتۆریەتی بێزەنتی وساسانی ئابلۆقەدرابوو.

گەڕانەوەی من لەوچەند پەرەگرافە زیاتر ئاشناکردنی روحی ئیسلامە کە پڕە لە تێزی جینۆساید یەکێ بوە لە ئامەنجە روحی وستراتیجێکانی خێڵەکانی عەرەب.کە هەمان ڕۆح و دەسەلات لە سەردەمی بەعسدا بە شێوازێکی مۆدێرن و ترسناك بەرجەستەکرا و گەلی کوردی کرا بە تاقیگەی ڕۆحیەت و ماهیەتی عروبە.

بە هەرحاڵ لەم بەشەدا ئێمە زیاتر لە ڕوی یاسای و سیاسیەوە جەخت لەسەر جینۆساید دەکەین.

پەیماننامەی ١٩٧٧تایبەت کراوە بە قەدەغەکردنی ئامرازی جەنگ و ئەو ئامرازانەی کە زیان بە سروشت دەگەیەنن کە تاوانی لەوتاندنی ژینگە و بەتاوانێکی نێونەتەوەی دیاری دەکات، دیارە لەوتاندنی ژینگەش دەبێتە هۆی فەوتاندنێکی لە سەرخۆی مرۆڤ.چونکە شێواندنی ژینگە دەبێتە هۆی بێۆسایدەواتا فەوتاندنی ژیان.ئەمەش نەك هەر کاردەکاتە سەر هەبونی مرۆڤ و ژیانی لەو ناوچانەدا بەڵکو بۆنی هەبونی هەمو گیانلەبەرێك و چۆنیەتی شێوەی ئاسایی سروشتی.بۆیە جینۆساید لە یاسای تازەی نێو دەوڵەتاندا وەکو تاوانێکی سەربەخۆ کە تایبەتمەندی جیاوازی هەیە لە گەڵ تاوانی دیکەدا دیاریکراوە هەربۆیەش لە تاوانی جینۆسایدا دوو پێکهاتە زۆر گرنگن کە دەبێ لە ڕوی مەبەستی و ژمارەی قوربانیەوە سەیر بکرێ.

١_ئەم تاوانە جیاوازە لە تاوانی دیکە،چونکە مەبەستی سەرەکی جینۆساید فەوتاندنی بەشێك یان سەرجەمی کۆمەڵە مرۆڤێکە جا بوونی مەبەستی نەهێشتنی کۆمەڵە مرۆڤێك چ بەشێکی یا سەرجەمی خەسلەتێکی تایبەتی بە جینۆساید دەدا ولە تاوانی تری جیا دەکاتەوە.

٢_ژمارەی قوربانی،لەبەر ئەوەی لە جینۆسایدا مەبەستی فەوتاندنە بۆسەر ژمارەی قوربانی لە بەرچاو ناگیرێ کەواتا هەر

به بوونی پێشنیاز لە فەوتاندنی هەر کۆمەڵە مرۆڤێك بێ،ئیتر مەبەستێ کە لە ئارادایە ئەنجامدانی تاوانەکەش مەرج نییە قوربانی زۆری هەبێ کەم وزۆر گرنگ نییە و لە بەرچاو ناگیرێ بۆ دیاریکردنی تاوانی جینۆساید و تاوانکارانی.

پەیماننامەی ١٩٤٨دەربارەی قەدەغەکردنی تاوانی جینۆساید سزاخستە سەر تاوانکارانی لە بەندی یەکەم دا ئەوە دیاری دەکات کە وڵاتانی بەشدار ئەو پەیماننامەیە لە سەریانە ڕێگە لەو تاوانە بگرن سزا بخەنە سەر تاوانکارانی،چونکە جینۆساید بنەماکانی یاسایی نێودەوڵەتانی پێشێلدەکات،ئەوە زۆر گرنگیشە ئەوەیە کە ئەو پەیماننامەی لە سەردەمی ئاشتی و جەنگیشدا لە کاردایە هەر وەکو بەندی یەکەم جەختی لەسەر دەکاتەوە.

کەواتا تاوانی جینۆساید خۆی نەك هەر لە سەردەمی شەڕدا بەڵکە لە سەردەمی ئاشتیدا ئەنجام دەدرێ، ئەمەش لە زانستی یاسای نێودەوڵەتاندا بەگشتی دانی پێدانراوە.

بەندی دووهەمی پەیماننامەی ١٩٤٨مەبەستی تاوانی جینۆساید دیاری دەکات دەڵێ:_ئەنجامدانی تاوانکارییە بە مەبەستی سەرلەبەر قڕکردن یان قڕکردنی بەشێکی هەرگروپێکی نەتەوەی،ئەتنیکی،ڕەگەزی یا ئاینی کەواتا وەکو(ریتشیەف)دەڵێ:_ئەگەر ئەو مەبەستە لە ئارادا نەبێ..ئەوە

ئەو كردەيە خەسلەتى جينۆسايد نييە..ئەگەرچى تاوانەكە لە تاوانيش بچێ كە لە بەندى دووهەمى پەيماننامەى ١٩٤٨دا ژمێردراوون چونكە جينۆسايد وەكو تاوانێكى ياسايى بەهۆى مەبەستەكەيەوە جياوازە لە تاوانى ديكەى كوشتن..لێرەدا بۆمان دەركەوت دەبێ مەبەستى قڕكردنى سەرجەمى يا بەشێكى كۆمەلە مرۆڤێك هەبێ بێ ئەوەى بتوانرێ جينۆسايد جيا بكرێتەوە لە تاوانى ديكە.

جۆرى تاوانەكەش وەكو لە بەندى دووهەمى پەيماننامەى ١٩٤٨دا دياريكراوە بەمجۆرەيە.

كوشتنى ئەندامانى ئەو كۆمەڵە و،زيان گەياندن بە لەش و شێواندنى بيرى ئەو كۆمەڵە،دانانى ئەو كۆمەڵە لە حاڵەتێكى سەخت كە ببێتە هۆى فەوتاندنى..نەهێشتنى منداڵبون،بەزۆر ڕاگواستنيان لە كۆمەڵێكەوە بۆ يەكێكى دى.

وڵاتە بەشداربوەكانى پەيماننامەى ١٩٤٨ئەو مەرجەيان خستوەتە ئەستوى خۆيان پابەند بونە كە سزا بخەنە سەر نەك هەر تاوانى ڕاستەوخۆى جينۆسايد بەڵكو وەكى بەندى ٣ى پەيماننامەكە دەڵێ:_جينۆسايد پيلان گێڕان بە مەبەستى جينۆسايد هاندانى ڕاستەوخۆ و ئاشكرا بەمەبەستى

جینۆساید،هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی جینۆساید..بەشداریکردن لە جینۆسایدا.

کەواتا تاوانکاری جینۆساید هەر ئەوە نییە ڕاستەوخۆ جینۆساید ئەنجام بدات بەڵکو یەکێك لەو کارانەی بەندی ۳ی پەیماننامەکە ئەنجام بدرێ ئەو ئەنجامدەرە بەرپرسیارە بەرامبەر تاوانی جینۆساید.بەندی چوارەمی هەمان پەیماننامە سزا دەخاتە سەر کەسانی دیاریکراوی تاوانی جینۆساید،هەروەها ئەوە دیاری دەکات،ئەو کەسانە ئەگەر وەزیفە ئەنجام بدەن،یا خۆیان سەربەخۆ ئەو تاوانە بکەن..ئەم تاوانەش پەیوەندی نییە بەوەی کە دەستور و یاسای ناوخۆی وڵاتەکەدا لێپرسینەوە بخاتە سەر ئەستویان یا نەیخات.

واتە جینۆساید ئەگەر لە یاسای ناوخۆی هەر وڵاتێکدا قەدەغە کرابێ یا نەکرابێ..مەحاڵە دەرباز بێت لە بەرپرسیارێتی نێو نەتەوەکەی،چونکە ئەو تاوانە بەگوێرەی یاسای نێودەوڵەتان و لە پراکتیکدا ئەوەندە سەختە و دڕندانەیە لێ خۆشبونی بۆ نییە.

بەندی شەشەمی پەیماننامەی ١٩٤٨پرەنسیپی سزادانی گوناهبارانی ئەنجامدەری تاوانی جینۆساید دەیچەسپێنێ کە دەبێ بە دادگایەکی ئەو وڵاتەی کە تاوانەکەی لێ ئەنجام دراوە دادگا بکرێ..بەڵام خۆ ڕێگرتن لەو جۆرە بڕیارە دەبێ پشت

بەهەمان دادگای ئەو ولاتانە نەبەستریٚ کە تاوانی جینۆسایدی لیٚ ئەنجام دراوە،لەبەر ئەوەی ڕەنگە ولاتەکە خۆی گوناهبار بیٚ بە ئەنجامدانی ئەو تاوانە، بۆیە پیٚویستە دادگایەکی نیٚونەتەوەیی سازبدریٚ.سازنەدانی دادگایەکی لەو جۆرەش دەبیٚتە هۆی سزانەدانی تاوانکارانی جینۆساید ئەم کیٚشەیەش لە کاتی دانانی پەیماننامەی ١٩٤٨بۆ قەدەغەکردنی جینۆساید لەلایەن کۆمیتەی شەشەمی کۆمەلەی گشتی.ر،ن،ی،لیٚ کۆلڕاوەتەوە.ئەنجامیش وا چارەسەرکراوە وەکو لەبەندی شەشەمی پەیماننامەکەدا دیاریکراوە کە تاوانبارانی جینۆساید لەلایەن دادگایەکی ئەو ولاتەی کە جینۆسایدی لیٚ ئەنجامدراوە یا لەلایەن دادگایەکی یاسایی جینایی نیٚونەتەوەیەوە سزابدریٚن.دەبیٚ لەلایەن بەشدارانی پەیماننامەکەوە هاوکاری ئەو دادگایە بکریٚ.

ئەگەرچی پەیماننامەی ١٩٤٨دەربارەی قەدەغەکردنی جینۆساید و سزاخستنە سەر تاواکارانی لە سالی ١٩٥١کەوتە کار بەلام تاکو ئیٚستە دادگایەکی لەو جۆرە تایبەتە بەتاوانی نیٚونەتەوەی وەکو جینۆساید دانەنراوە کەلیٚ لە تاوانکارانی جینۆساید کە بە فەرمانی ولاتەکەیان ئەنجامیان داوە لیٚیان نەپرسراوەتەوە.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش بەڵام ئەو بڕیار و یاسایانەی لە پەیماننامەی ١٩٤٨دا دانراون لە دژی جینۆساید هەتاکو ئێستا بە بێهێزی ماونەتەوە،بۆیە پێویستە بنەمای نێونەتەوەی دیکە بهێنرێتە کایەوە دژی جینۆساید.

# بەشی دووهەم

❖ جیاوازی دیلو کۆیلەکانی سەردەمی ئیسلامو سەردەمی صدام حسین

# جیاوازی دیل وکۆیلەکانی سەردەمی ئیسلام‌و سەردەمی صدام حسێن

بەرلەوەی بچینە سەر بزوتنەوەکانی فاشیزم لەم بەشەدا باس لەکۆیلەیەتی سەردەمی ئیسلام دەکەین ئەومێژوەی کەدرێژەی بەهەمان سیاسەت ورەفتارەکانی سیستمی صدام حسێن دەدا.

هەروەها شێوەی مامەڵەکردن لەسەردەمی کۆن ونوێدا تاکاتی ئەنفال دیدوبۆچونی خێڵەکانی عەرەب لەسەر ئەودیلانەی دەگیران وشێوەی مامەڵەکردنیان ..تاکاتی صدام حسێن ئەوپیاوەی موتربەکرابوو بەرۆحی شوفینستانەی عەرەب وفاشیستە جەوهەرێکانی خێڵەکانی عەرەب وفتوحاتەکانی ئیسلام، ئەگەرچی من خۆم پێم وایە هیچ مرۆڤێکی لەسەر زەوی پەیوەندی بەخوداوە نییە تا ببێ بەنوێنەری خودا بەلام ، رۆحی شەرانگێزی وشەهوەت وتامەزرۆبون بۆ دەسەلات ودەستبەسەراگرتنی سامان وخۆشێکانی دونیا یەکێکە لەفاکتەرە بنەرەتی ئەزەلێکانی ئینسان بەرەو چاك وخراپە..لای من کۆی مێژوی مرۆڤایەتی رۆحی ئەفسانەسازی وچاوچنۆکی ودەست بەسەراگرتنی بۆ شتەکان حوکمی دەکات.

ئەوەی لێرەدا پێویستە پشانی بدەم شێوەی مامەڵەکردنی دیلەکانە لەسەردەمی صدام حسێن وهەمو سیستمە ئاینی وسیاسێکان کەهەمان شێوازیان گرتوەتە بەر بۆیە ئەوەی لەمێژوی خوێناوی مرۆڤایەتی بە ناوی هەرچیەکەوە مابێتەوە یەکێکە لەپەڵە وعاری مێژوی سیفەتە بەربەریەکانی مرۆڤ لەژێر پەردەی هەر ئاین وبیر وعەقیدەیەکدا بێ..ئەمەش تەنها پاساوێکە بۆ شەرعیەتدان بەکوشتن وچێژی کوشتن شکۆی دەسەڵات.

لای کەس شاراوە نییە دیلەکانی جەنگی ئەنفال بەرەوکوێ بران؟ بەڵام کەسیش نازانێ کران بەچی کۆیلەیەك وبەچەند قۆناغ لەناوبران، تەنانەت شێوازی بردنەکانیان لە دەستێکەوە بۆدەستێکی دی شێوازێکی نوێ ونکردن وقڕکردن بوو..ئەمە سەرەڕای جیاکردنەوەی ئینسان بەش بەش..جیاکردنەوەی کچەکان بۆ ئیختساب کردن وپاشان لەت وپەتکردن وئەمجار فرۆشتنی وەك کۆیلە بەوڵاتانی عەرەب لەدەرو دراوسێ..ودابەش کردنیان لەناومەلهەکان ودیسکۆکاندا...یان کوشتنی بەکۆمەڵی گەنجەکان تاقیکردنەوەی چەکی کیمیاوی بەسەریاندا ویان هەرکۆیلەیەکی دیل لەکچەکان بەسەر ئەفسەر وپلەدارەکان دابەشکران، جیاکردنەوەی پیرو پەکەوتەش بۆ عەزابێکی ئەزەلی پاشان لەسەرابدا بەرەلایان دەکردن.

ئێمە بەکورتی دەتوانین دەیان چیرۆکی ئووستوری لەزمانی ئەنفالەکانەوە بگێڕینەوە کەمن بۆخۆم دەیان چیرۆکم لایە سەرەڕای ئەوەی خۆم وەکو پێشمەرگەیەك لەسەرەتای ئەنفالەوە تادواشەڕەکان بەشداربوم وبە بەرچاوی خۆمەوە سەدان چیرۆك وتراژیدیای ئەفسانەیەم لایە دەکرێ لە رۆمانێکدا هەمو ئەمانە باس بکرێ .بەڵام بابزانین پێش ئیسلام وسەردەمی ئیسلام کۆیلەکان چییان لێ کراوە.چۆن مامەڵەیان لەگەڵ کراوە شێوەکانیان چی بوو.

بازرگانیکردن بەکۆیلەوە وەك کالآیەك کەنرخی بەکارهێنانی هەبووە رۆژ بەرۆژ لەپەرەسەندندا بوە، کۆیلە لەناو کۆمەڵگەی ئیسلام وەك کۆیلەی هەرشێوێکی تری سەرزەوی چینێکی کۆمەڵایەتی بون ، لەپرۆسەی بەرهەمهێنانی سامانی مادیدا، هێزی بەرهەمهێن بون بێ ئەوەی خۆیان خاوەنی هیچ بن، کۆیلە لەبواری ئالوگۆڕکردندا کەل وپەل وبابەتی بازرگانی سەرچاوەی قازانج وکەڵەکەکردنی سەروەت وسامان بون، سامانی زۆر خۆش گوزەرانی بۆخاوەنەکانیان دابین دەکرد.

لەکۆمەڵگای کۆیلاتەتیدا ((بەدەگمەن خاوەن کۆیلە رێگەی بەکۆیلە داوە وەچە بخاتەوە،تەنانەت کۆیلەی خاوەن ژن ومنداڵ نرخێکی ئەوتۆیان نەکردوەو لەبازاردا فرۆشی نەبوە..کەچی

لەکۆمەڵگای عەرەبدا بەپێچەوانەوە خاوەن کۆیلە ئافرەتی کۆیلەی ناچارکردوە لەگەڵ پیاوان جووت ببن تامنداڵ بخەنەوە منداڵەکانی بۆ فرۆشی بەکار هێناوە.

مێژوناسان دەگێرنەوە:_(عەبدوڵلا کوڕی جەدعان ئەلتیمی ) کە بازرگانێکی گەورە بوە ژمارەیەکی زۆری کەنیزەکی بوە ناچاری کردوون لەگەڵ پیاوان جووت بن تا منداڵیان ببێ وبیانفرۆشێ ، کۆمەڵگای عەرەبستانی بەرلە ئیسلام کۆیلەیەتی تیایدا سیستەمێکی کۆمەڵایەتی بوە بەڵام ئاینی ئیسلام هیچ سنورێکی بۆ کۆیلەتی دانەناوە،تەنانەت بەوانەشەوە کە بڕوایان بەئاینی ئیسلام هێناوە ئازاد نەکراون..مەبەست لەکۆیلەکان.

ئازادکردنی کۆیلە لەسیستەمی کۆمەڵایەتی ئیسلامدا بەندبوە بەچەند حاڵەتێکەوە کە قورئان شەرایتی بۆ دانەناوە.لەسەردەمی ئیسلامدا تەنیا کۆیلەکانی غەیرە عەرەب بکرێنە کۆیلە وئەو عەرەبەش تا ئەوکات کۆیلە بون ئازادی کردن..ئەمەش لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا ڕویداوە.

ئاینی ئیسلام باسی چاککردنی حاڵی کۆیلەی کردوە بەڵام ئەو چاککردنە مانای ئازادکردن نەبوە..ئیسلام هەرگیز کۆیلایەتی حەرام نەکردوە بەڵکو هەمیشە وشەی(عەبد)لەجەوهەری ئیسلامدایە.ئەگەرچی ئەم حاڵەتە بۆ خودا پەرستن بەکار هاتووە

بەلآم ئینسان بۆ مەلەزاتی خۆی بەکاری هێناوە چاککردنی حاڵەتی کۆیلەش لەسەردەمی ئیسلامدا تەنها ڕەخنەگرتن بوە لەرەفتاری خاوەن کۆیلەکان کە بەشێوەیەکی زۆر خراپ مامەڵەیان کردوە..هەڵوێستی ئاینی ئیسلام لەئاست سیستەمی کۆمەلآیەتیدا هەڵوێستێکی ئەخلاقیە نەك یاسای..بگرە کۆیلە تەنانەت لەبەردەم یاساشدا شەهادەتی قبوڵ نەکراوە، بۆ جیاکردنەوەشی لەخەڵکی تر دەبو مۆرێك لە گەردنی هەڵبکەندرێ..لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش بۆچی ئاینی ئیسلام کۆیلایەتی حەلآڵ کردوە؟ ئاینی ئیسلام بەمجۆرە لەچەند ئایەتێکدا جیاوازی نێوان ئینسانەکان ئاشکرا دەکات ولەسورەتی الاسراو ئایەتی ٢١دا دەڵێ:_(**انظر كيف فضلنا بعضهم على بعض وللاخرة درجات واكبر تفصلا**)ئەمجار لەسورەتی زەحرەف لەئایەتی٣٢دا دەڵێ:_(**هم يقسمون رحمة ربك نحن قسمنا بينهم معيشتهم في الحياة الدنيا ورفعنا بعضهم فوق بعض درجات ليتخذ بعضهم سخريا رحمة ربك خيرمما يجمعون**).ئەمانە لەپشتیەوە هۆکاری جدی هەبوە لەوانە ئەو کاتەی ئاینی ئیسلام هاتە ئاراوە سیستمی ئابوری کۆمەلآیەتی لە نیمچەدورگەی عەرەبستان هێشتا ئەو قۆناغەی تێنەپەڕاندبوو بتوانێ دەستبەرداری کۆیلە بێ ئەو

ئایەتانەش قسە لەسەر ئازادکردنی کۆیلە دەکەن سزای ئابوری و ڕۆحی خاوەن کۆیلەی پێ چاوترسێن دەکرێ.

لەهیچ ئایەتێکدا باس لە ئازادکردنی کۆیلە نەکراوە بەپێچەوانەوە داوا لەموسلمان دەکرێت ئەوەی سامانی زۆری هەیە بەشی کۆیلەی لێ نەدرێ.

مەبەست لەم نمونانە تەنها بۆ دەوڵەمەندکردنی باسەکەمانە کە ژینگەی عەرەبی بەهەمو بەها ئەخلاقیەکانەوە لەسەری ڕاهاتون کە عەفلەق و صدامیش کوڕی ئەو خێڵانە بون..بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەتا دەڵێ:_ سێ کەس شایەنی ئەوە نین قسەیان لەسەر بکرێ(ئەو پیاوەی لەکۆمەڵدا گۆشەگیر دەبێ.ئەو کەسەی لە ئیمام یاخی دەبێ ولەسەر ئەو باوەڕە دەمرێ..کۆیلەیەك لەخاوەنەکەی هەڵهاتبێ وبەهەلاتوی مردبێ.هەروەها سێ کەس نوێژیان قبوڵ نیە شتە چاکەکانیان ناگاتە ئاسمان...یەکەمیان ئەو کۆیلەیە کە لەخاوەنەکەی هەڵدێ مەگەر بگەڕێتەوە لای خاوەنەکەی ئەم ڕاستیانەش لەئایەتەکانی سورەالمائدە ئایەتی٨٩هەمان سورە ئایەتی ٩٢سورەاعباد لەئایەتی ٣و٤سورەتی نحل ئایەتی٧١ هەیە.

شەڕوشۆڕی ئیسلام وداگیرکردنی وڵاتان سەرچاوەیەکی باش ولەبنەهاتوی بەدەستهێنانی کۆیلە بوە کەدوایی لەبواری

کشتوکاڵ وئاودێری وشوانکارەی وەپیشەی هەمەجۆردا کاریان پێ دەکرا..لە غەنیمەکانی غەزەواتی صدام حسێن دا دژی شارەکانی ئێران وکوێت وئەنفالی گەلی کورد بەرپرسە جەنگێکانی سوپا سەرپشك بون لەهەمو دەستکەوتەکانی مادی جەسەدی کە بەدەیان وسەدان نمونەمان هەیە کە لەسەردەمی مۆدێرنە ئەم پاشخانە ئەخلاقی وسەربازی ومادی ومەعنەویە جارێکی تر لەژێردەستی سوارچاکەی عروبە صدام دوپات وهەزارپات کرایەوە.

وەك لای زۆربەمان ئاشکرایە هەمو ئیمپراتۆریەتە گەورە وکۆنەکان لەرێگەیشەڕو داگیرکردنەوە دروست بون..ئیسلامی عەرەب لەرێگەی فتوحات وغەزەواتەوە یەکێك بون لەئەباترەکان کە لەرێگەی کوشتن وتالآن وقرکردنەوە وشوێن پێی خۆیان کردەوە.کۆیلەیەتیش بۆخۆی بەرهەمی شەڕوتالآن وبڕۆی ئەو جۆرە دەوڵەتانە بوە.

لەسەردەمی ئەمەویەکاندا رۆژ لەدوای رۆژ ژماری کۆیلە لەزیادبوندا بوە لەشەڕوشۆرەکانی زۆری ئەفەریقادا سەرکردەیەکی(وەکو موسا کوری نەصیر)٢٠٠هەزارکەس لەخەڵکی ئەو ناوچانە بە دیلگرت وپاشان٦٠هەزاری لێ ناردن بۆ(خەلیفە وەلید کوری عبدولملیك)لەمەوە تێدەگەین کە هەم دەوڵەت وەکو

دامودەزگایەکی سیاسی هەم تاکەکەس لەسیستمی ئیسلامدا مافی ئەوەیان هەبوە خاوەنی کۆیلە بن وچەندیان بویێ ڕایگرن.

لەسایەی دەسەلآتی ئەمەویەکاندا کۆیلەی نێرینە لەو مافەش بێ بەشکراوە کە سروشت پێی بەخشیوە، دەسەلآتدارانی سەردەمی ئیسلام کە لەدەربار وحەرەمسەرادا پێویستیان بەهێز وکاری کۆیلە دەبوو،بەشێوە دەست وپێوەند ونوکەر وخزمەتکار ڕایان دەگرتن بەر لەهەموشتێك خەساندۆیانن(خەلیفە موعاویە)یەکەم دەسەلآتدارە کۆیلەی بەخەساوی لە حەرەمسەرادا ڕاگرتوە.لەسەردەمی عەباسیێکانیشدا ئەم نەریتە نەك هەر پەیڕەو کراوە بەلکە پەرەشی پێ دراوە بۆنمونە.لە حەرەمسەرای خەلیفە(موقتەدیر)دا ١١هەزارکۆیلەی خەسێندراوی تێدا بوە.ئەمە بێجگە لەکۆیلەی ژن کەنیزەك وکارەکەر بون.کۆیلەکانی ژن هۆیەکی گرنگ بونە بۆ ڕابواردن ولەزەت وەرگرتن زۆرجاریش لەخاوەنەکەی سکی پڕبوە لەم حالەتەش خاوەنەکەی مافی فرۆشتنی لەدەست داوە، لەم بوارانەشدا کۆیلەکان چەندین ڕاپەڕینیان ئەنجام داوە لەوانە:لەسەردەمی خەلیفەی عبدالملك)کۆیلە لەدژی دەولەتی خەلافەت ڕاپەڕین دوای ئەوەی چی کۆیلەی بەندکراوی هەبون ئازادیان کردن لە شار چونە دەر

وڕوبەڕوی سوپا بونەوە لەبەردەم هێزی سەربازی سوپا شکستیان خوارد.

ساڵی٧٠ی کۆچی کۆیلەی زەوی کە هەستیان بەوەکرد سوپا لەشکری دەوڵەت سەرقاڵی شەڕوشۆڕە،لەخوارووی عێراقدا ڕاپەڕینیان بەرپا کرد ئەم ڕاپەڕینەش سەرکوتکرا وساڵی٧٥ی کۆچیش لەو کاتەدا کە(حەجاج کوڕی یوسفی شەهقەفی)دەسەڵاتدارێتی عێراقی پێ سپێردرا کۆیلەی زەوی بەسەرکردایەتی ڕەباح کە بە(شێری زەنگ)ناسراو بوو ڕاپەڕینێکی گەورەیان بەرپاکرد دوای چەند شەڕوپێکدادان لەگەڵ سوپای دەوڵەتی خیلافەتدا شکستی خوارد.

تەبەری دەڵێ:_ ٢٢٣ی کۆچی لەدوای شەڕی عەممورییەوە ئەوەندە خەڵك بەدیل گیرا بون پێنج پێنج ودەدە بەسەر یەکەوە دەفرۆشران.هەروەها بەتەنها لە زەوی وزاری دەورووپشتی ڕوباری دوجەیل دا ١٥هەزار کۆیلە پێکەوە کاریان کردوە.دەربارەی حەرەمسەرایش پڕبوون لەو کۆیلە وکەنیزەکانەیش لە(سەمەرقەند)وقەندەهارەوە هێنرابون..لەپایتەختی خیلافەتدا دەفرۆشران تورژێکی کەمیش پارە وپولی لەسەر کۆدەکردنەوە.

هەڵپە کردنی دەسەڵاتدارانی سەردەمی خەلیفە وتێکڕای دەسەڵاتدارانی بۆ دەستخستنی زۆرترین کەنیزەك ودەستوپێوەند

ڕەواجێکی وەهای دا بەم بازرگانیکردنە کە دامودەزگای تایبەت بەم کارە بکەن وجگە لەکڕین وفرۆشتنی کۆیلەی ژن سەماو ومۆسیقا گۆرانیشیان فێرکەن.

کۆیلەکانیش دوای ئەوەی لەحەرەمسەرای خەڵیفە دەسەڵاتداراندا خۆیان دەبینیەوە سەرەڕای کاری خزمەتگوزاری دبونە هۆی ڕابواردنی خاوەنەکانیان..

مەسعودی دەڵێ:_خەلیفە(متەوەکیل)لەحەرەمسەرادا چوارهەزار کەنیزەکی هەبوە..جارێکیش یەکێ لەسەرکردەکانی دووسەد غولام وکەنیزەکی پێشکەش کردوە..لەم مەیدانەشدا کۆیلەی نێرینەش لەسایەی ئەو سیستمەدا دوچاری ڕابواردن بونەتەو.

(ئەمین)لەسەردەمی دەسەڵاتدارێتی خۆیدا ڕەسمیەتی دا بەنێربازی بەپێ یاسایەی ئەو دەریهێنا، خاوەن کۆیلە بۆیان هەبوومومارسەی سێکس لەگەڵ کۆیلەی نێرینە بکەن.لەسەردەمی(مەعەمەیش دا)هەمان نەریت ڕویداوە یەحیا کوڕی ئەکپهم کە قازی شەرعی بەسرە بوە هەمان کاری لەگەڵ کۆیلە نێرینەکان ئەنجامداوە.لەناوەڕاستی سەدەی سێهەمی کۆچیدا پاش ئەوەی سستەمی کۆمەڵایەتی گەیشتە ڕادەی تەقینەوە ڕاپەڕینی کۆیلەکانی خواروی عێراق کە لەمێژودا

بەشـۆڕش زەنـگ نـاوی دبـەرێ هـەزاران هـەزار كۆیلـە لـەڕێزی بەگژاچـونەوەی دەسـەلاتی خەلیفـەدا ڕێكخـست ولـەماوەی چواردەسـالدا تـەخت وتـاراجی دەسـەلاتی خەلیفـەیان هێنایـە لـەرزە.ئـەم ڕوداوەش لەمێـژووی ئیـسلامدا مێژویـەكی تایبـەتی هەیە.بەلام لێرەدا دەگەڕینەوە سەر جەوهـەری باسـەكەی خۆمـان كـە ئـەویش كۆیلـە ودیلـەكانی ئەنفالـە ئـاخۆ صـدام حـسێن ودەزگاكانی بەچی شێوەیەك مامەڵەیان لەگەڵ كردن؟ئاخۆ هەمان شێوە یان جیاوازیان نیە؟ بەلای منەوە ئەوەی جیاوازی بێ تـەنها شـێوەی ئەنجامـدانی پرۆسـەكە وئـەو كوشـتنە نهێنیـە سەرسامكەرەیە كە تائەمڕۆ هەواڵیان نیە.ئەگینا لەباری ئیختساب وزەویزار وبەكارهێنانی مـادی ئـەم ناوچـەیە جیاوازیـەكی ئـەوتۆی نیە.

سـالی١٩٨٨دوای ئەنفالـەكان وڕوخانـدنی گونـدەكان ئێمـە دەستەیەكی پێشمەرگەی چەكدار بوین لەنزیك شاری دوزخورمـاتو خۆمان حەشاردا بوو لەمانگی ٦و٧دەڕاسەكانی حكومـەتی عێـراق هـەمو دەغلـودانی ناوچـەی داودە وشـوێنەكانی تـری كـۆكردەوە بەپشتیوانی هێزەكـانی موجاهیـدینی خـەڵق._ئەمـە جگـە لـەوەی لـەكاتی پرۆسـە بەدناوەكـەدا سـەرەك جـاش وموستەشـار ودەزگاكانی سوپا وئەمن وئیستخبارات هەمو ئەو مەڕومالاتانـەیان

بەسەر خۆیان دابەش کرد کە لەگوندەکان دەستیان بەسەرا گرت..

ئەوەی لێرە مەبەستمە بیڵێم ئەوەیەکە من تەنها جیاوازی ڕەشەکوژی دەبینمەوە کە بە دیل گیران وبەزیندوی کوژران، لەکاتێکا ئەم هێزەی خەڵك هێزی ڕووبەڕووبونەوە نەبوو تەنها خەڵکی گوندنشین بون وژیانی ئاسایی خۆیان دەبردەسەر...ئەوەی لێرەدا دەیخەینەڕوو بەشێکە لەو ڕۆژگارانەی خۆم وەکو پێشمەرگەیەك تیایدا بەژدار بوم ولەو پرۆسەیەشدا براکانم تیایدا شەهید بون.

ئێستاش دەگەڕێینەوە سەر چیرۆکە تاڵەکانی سەردەمی ئەنفال تا لەوڕێگەیەوە بگەینە جەوهەری چێژی کوشتن لای خێڵەکانی عەرەب.ئەم ئەفسانەیە چی بوو لەسەرابدا ڕوویدا.

ساڵی١٩٨٢ بۆیەکەمین جار لەژیانمدا بیابانێکی بێ سنوری فراوانم بینی لە ئۆردوگای نوگرە سەلمان ٢٥٠ خێزانی پێشمەرگە بوین لەزیندانی فزەیلیەوە لەبەغدا بۆسنوری نێوان سعودیە وعێراق بە ژن ومندالّ وپیاو وپیرەوە بردینیان.. لەناحیەی(بصەییە)سەر بەپارێزگای سەماوە...ڕەوانەی ئەو دۆزەخە کراین...لەوێ لە ئۆردوگای نوگرە سەلمان ٨مانگ ماینەوە لەگەلّ دوپشك ومار وڕەشەبای چەندان سەعاتی

خۆڵبـارین..تاسـاڵی١٩٨٢دوایـی ئـەوەی دوو پرۆفیـسۆری پۆلـۆنی لەلایـەن دەسـتەیەك لــە پێـشمەرگەکانی حزبـی شـیوعی گـیران ورەوانەی بارەگاکانی(کەرەجاڵ)کران..یـەکێك لـەو پێـشمەرگانەی کە پۆلۆنێکانیان گرتبوو شهید بهاوالدین ی برام بـوو کـە لەشـەڕی تازەشدا لەساڵی١٩٨٨لەئەنفالـدا دژ بەسوپای داگیرکـەری عێـراق لەگــەڵ ٢٢پێـشمەرگەی ی.ن.ك.شـەهید کـران.. ئەوانــەی کــە پرۆفیسۆرەکانیان گرتبوو شەهید بهاوالدین ناسراو بـە ماجـد.مـام سـتار_ناسـراو بەغـەریب سـەرپەلی حزبـی شـیوعی..عـەزیز کـریم شێخەوەنی پێشمەرگە.

پـاش ئـەم ڕوداوە لەئـەنجامی توپبـارانی یـەکێ لـە بنکـەکانی کەرەجاڵ یەکێ لەو پرۆفیسۆرانە دەکوژرێت ودەبێتـە کێـشەیەکی گەورە لەنێوان حکومەتی پۆلۆنیا وعێراق وداوای ساغ وسـەلامەتی ئـەو دوو پرۆفیـسۆرە دەکـەن..ناچـار حکومـەتی عێـراقیش پـەنا دەباتە بەر گۆڕینەوەی دیلـەکان یـەکێ لەمەرجـەکانی ئـازادکردنی خێزانــی پێــشمەرگە بــوە..ئێــدی لەســاڵی١٩٨٢ هەرچــی ئــەو خێزانانـەی نـوگرە سـەلمان بـوو ئـازادکراین.لـەو کاتـەوە تاکـاتی ساڵی١٩٨٨ساڵی پرۆسەی بەدناوی ئـەنفال دەسـتی پێکـرد ئێـدی مــن حیکایــەتی بیابــان لەخــەیاڵ ویادەوەریــەکانم بەئاســتەم مایەوە..تەنها ئەو کاتانە نەبێ کە وەك تارمایەك ڕابردوی ٨مانگی

ئەم دۆزەخەم کردەوە تائەو ڕۆژەی لەنوگرەسەلمان ئازاد کران کە ئێمە دەستەیەکی بچوکی پێشمەرگە مابوینەوە بۆدژایەتی کردنی بەعس.

شەوانی ئوردوگای صمود گەڕان بەنێو ئەو دەموچاوانەی حیکایەتی مردن وئەفسانەی مردنیان هێنا بوو گەڕانەوەیەکی دیکە بوو بۆمن کە من لەمندالّی لەتەمەنی١١سالّیدا ئاشنای ئەو بیابانە کرام وئێستاش سەربوردو تراژیدیای قەتلّوعامی نەتەوەکەی خۆم لەزاری ئەو کەسانەوە دەبیستم سەردەمێك لەدێهاتەکانی گەرمیان وناوچەکانی تری کوردوستان وەك پێشمەرگە خزمەت وهاوکاریان دەکردین.بەهەرحالّ ئەم سەرەتایە بۆمن گەڕانەوەیەکی چیرۆك ئامێزە کە دوای ٧سالّ ڕەوەمرۆڤێکی گەورەتر بەرەو قەتلّ وعام دەبرێن وبێ ئەوەی ئەم هێزە یان لیوایە بزانن لەکوێ بۆکوێ وکێ لەناویان دەبات...

گێڕانەوەی حیکایەتەکانی تەیمور وعوزێر وعومەر وئیبراهیم بەشێوەیەك لەشێوەکان گێڕانەوەی سروت وخیالّی ڕۆحی من بوو بۆ ئەو شوێنانەی لەسەردەمی مندالّیمدا بەشێوەیەکی نەرمتر زیندان کرابوین..بۆیە باسکردنی ئەو شێوە مردن وکوشتنە جۆرێك لەئاشنایەتی منی تێدایە وەك شوێن وڕاگواستن وبێ سەروشوێن

کردن وئازاردان وچاندنی خەیاڵێکی گەورە لەتراژیدیا ڕەنگە ڕۆژێ لەڕۆژان ببێتە زادەی ڕۆمانی ئەنفال..

ئەفسانەی ئەم چوار کامیرایە کە بەزیندوی مانەوەو وەك کەسانێکی زیندو بونە شایەتحاڵی گەورەترین تراژیدیای نەتەوەی کورد ئەمڕۆ دونیا لەڕێگەی ئەم زمانانەوە ئازارەکانی گەلی کوردیان وەك جینۆساید لەدونیادا ناساند.

عوزێر لەدواشەوی تۆپزاوایدا لەسەرما هەڵدەلەرزی ، گوێی لەگرم وهوڕی مەکینەی پاس ڕایەڵ کردبوو ، لەگۆلاوی چەوری ودیزل وخوێنی تازەی سەرچیمەنتۆکە ڕامابوو.عوزێر تەمەنی ٢٥ساڵ دەبوو کرێکارێکی سەڵتی بینا بو.لەگوندی تەرجیلی سەرڕێگای نێوان کەرکوك وناحیەی لەیلان لەدایك بو تا لەجافان نیشتەجێ بو کە گوندێکی ١٧ماڵی بوو تاساڵی١٩٨٧مایەوە تاساڵی ١٩٨٧سوپا هێرشی بردەسەر ئەو گوندەو سوتاندی ، پاشان عوزێر دەچێ بۆ خدر ڕەیحان کە گوندێکی بێ دەنگ وسەنگ بوو.کەماوەی دووساعەت ونیو لەقادرکەرەمەوە دوربو.

پاش ئەوەی لێبوردن دەدرێ عوزێر خۆی دەدا بەدەستەوە دوایی بەچەند ئۆتۆمبێلێك دەگوازرێتەوە بۆ ئۆفیسی ئەمنی ناوچەکە ، یەکێ بو لەو کاروانەی کە کەوتە ناو حەشامەتی شارۆچکەی چەمچەماڵ دواجار لە١٤ی نیسان گەیشتە تۆپزاوا.

ناوپاسەکان دۆزەخێك بووە بۆخۆی ئەو پاسەی عوزێر وئیبراهیم ومستەفا سواری بون بە میز وپیسای بنیادەم سواغدرابو ..سەرنشینەکانی پێشوی بەکورتی پەیامی کورتیان نوسیبوو وەك بلێ ئەمە زەنگی ترسناکی بەجێ ماوی ئەوان بێ بۆ ئەوانەی دوای خۆیان دێن وهەر بەم پاسانە ڕەوانەی ناو سەرابەکانی بیابانی جەزیرەی عەرەبی دەکرێن...نوسرابوو(بۆسنوری ئەمیرو ئال خەلیفەکانی سعودیە..بۆسنوری کوێت بۆعەرعەر ئەو عەرعەرەی ساڵی١٩٨٢لەگەڵ خێزانەکەم بەمندالی دەریای عەرعەرم بینی وتیایدا ڕاوە شەوگەردو ژوو ژوو ودوپشك ومارمان تیادەکرد..بیابانێك بەس تەنها خودای لێ بوو لەگەڵ بڕیاری جەلاد.لەم جۆرە پاسانەدا شوێنی بەندێکان بەدەرگایەکی قفل دراو..هەمان ئەو دەرگایانەی کە لەتەمەنی ١١ساڵی بینیبوم لەشوێنی تایبەتی شۆفێرەکە جیاکرابوەوە.شوفێرەکەش خۆی لەجێگایەکی جیاواز سەردەکەوت سەربازێکی پیسی عروبەش بە تفەنگێکی کلاشینکۆفەوە بەبەرگی هێزی تایبەتی سوپای پوشیبوو.بەڵەك بەڵکی زەرد وقاوەی پەڵەی سەوزەوە لەگەڵ بێری سور نیشانەی ئالتونی باڵندەیەك کەباڵەکانی کردوەتەوە لەدۆخی پەلاماردانی نەچیردایە.لەناو ئەو دەرگایە کە شوێنی

شوفێرەکەوە سەرنشینانی جیاکردبوەوە دەلاقەیەکی تۆڕ ئاسا هەبوو نزیکەی شەش ئینجی چوارگۆشەی دەبوو ئەو بەندیانەی لەپێشوە بون دەیانتوانی ڕێگاکە ببینن ولەئاوێنەی سەر شۆفێریشەوە دواوە ببینن..بەمەزەندەی عوزێر پاسەکەی ئەوان ٣٥مین پاس دەبوو لە کاروانەکەدا.سەرنجی ئەوەشی دابوو لەنێوان هەر پاسێك پیکاپی ئەمنی لێبوو بەپاش وپێشی پاسەکان دەڕۆشتن.هەر یەکەشیان ڕەشاشێکی لە سەربوو.

یەکێ لەبەندێکان ئەنوەر تەیار بوو داوایان لێ کرد هەرچونێك بێت تەماشا کات تابزانن بەرەو کوێیان دەبەن ، ئەویش دوای تەماشاکردن وای بۆچوبوو بەرەو (موصلّیان) دەبەن بۆیە هەمۆیان تۆقی بون هەناسەیان لەبەر بڕابوو چونکە ئاشنابوو کەزۆربەی پیاوکوژەکان لەموسلّ بون کۆیلە ودیلەکان بڕوایان بەوەهێناوە کە بەرەو مردن دەیانبەن.

فرەی پێ نەچوو پاسەکان لەڕێگەی موسلّ لای داو ڕوی لەباشوری ڕۆژئاوا کرد...ئەنوەر تەیار ئاهێکی خەستی هەلّکێشا وگوتی:_"مژدە،ڕزگارمان بوو"بەلاّم پاسەکان ناوبەناو تۆزێك دەوەستان لەو وەستانەدا حەشامەتی خەلّکەکە کەوتبونە پاڕانەوە دەستەودامێنی قوات خاصەکان کە ئاویان فریا خەن...کابراش لەولاّمدا..ڕاوەستن کەمێکی تر))ئاو هەر

نەگەیشت..لەتاو گەرمی وپیسی وهەوای خنکێنەر ناچار دیلەکان میزەکانیان دەکردە پێڵاو ودەیانخواردەوە.

کات دوایی نیوەڕۆ ئەنوەر تەیار خۆی پێ نەگیرا ولە شوێنێکدا هاواریکات وبڵی..((سەماوەیە)) ئاە...سەماوەیە..کاروانی ساڵی١٩٨٢ی ئەو٢٥٠خێزانەی ئێمە لەئێوارەیەکی خۆرئاوابون گەیشتین..منداڵبوم لەو ئێوارەیەدا توانیم بەسەر جێگا وپێخەفی زیندانییێکان دەرەوە ببینم کەتیپێکی فوتبوڵ لەسەماوە یاری دەکرد..هەمان ئەو کاتانەم بیردەکەوتەوە کە لەگەڵ عدنان محمود رەعد کەمیلە شێت سیروان وعەباس وەکە لەتیپی منالانی یادگاری شاری دووزخورماتوو یاریم دەکرد..

لەو سەفەرەی ئێمەدا هەموشتێك ئەفسانە بوو تەنانەت تراژیدیا وئازاریش هەر ئەفسانە بوو...بەڵام کاروانی ئەنفالەکان لە دوایی ئەوەی لەجەنگە دۆڕاوەکانی ئێمە تێکشکاین کاروانی مردن وبێ سەروشوێنکردن بوو.بەڵام یەکێ لەبەندێکان ئەوشارۆچکەیە گەورەیەی سەرڕۆباری فوراتی ناسیەوە کە فەلوجە بوو..

کاتێ کاروانە تیپەڕین عوزێر تێبینی ئەوەی کردبوو کەکاروانەکە دەبێ بەدوو بەشەوە زۆربەی ئۆتۆمبیلەکان بەلایەکی ترا ڕۆشتن..پێنج دانەشیان کە پاسەکەی عوزێر و ئۆتۆمبیلە سەوزە گەورەکەی مستەفای تێدا بون بەرەو ڕۆژئاوا ملیان

نا.ڕوەو ئەو شوێنەی خۆر نزیک ئاوابون تیایدا..هێندەی نەبرد شاری ڕومادیان بەجێ هێشت وکەوتە لای چەپیانەوە.پاش چارەك نیوسەعاتێك تێپەڕین ئەوجار بەلای ڕاستدا بایاندایەوە بۆپەڕینەوە لەپردێك کە پاسەوانیەکی توندی لێ دەکرا بەسەر ڕوبارێکەوە بوو پێ دەچوو فورات بێ.لەودیوی پردەکەوە ئۆتۆمبیلەکان وەستان...کات شەش ونیوی ئێوارەبوو..لەتۆپزاواوە تائەوێ ١٠سەعاتیان پێ چوو..لەڕێ بینینی دیمەنەکانەوە لەلای پۆلیسخانەیەکدا لەژێر کۆمەڵێك دارخورما وەستان وگوێیان شل دەکرد بۆ گفتگوی نێوان یەکێك لەگاردەکان وئەفسەرێکی پۆلیسی مەرکەزەکە.ئەفسەرەکە بەگەورەم بانگ دەکرا بەڵام نیشانەی ئەفسەری بەجلەکانیەوە دیار نەبوو.

زۆری نەبرد ناوەکانی تەسلیم بە بەڕێوەبەری پۆلیسخانەکە کرد وپێی ڕاگەیاند کە ئۆتۆمبیلەکان لای پۆلیس دەمێننەوە تاکارەکە تەواو دەبێت.ئەو کاتە پێویستە بگەڕینەوە.

لێرە شۆفێرەکان وگاردەکانی هێزی تایبەت دابەزینە خوارەوە ئەوان جێیان گرتنەوە وبەرگ سەوزبون وبێری ڕەشیان لەسەردا بوو..پاشان ئەفسەرەکە وئەوانیتریش خۆیان هەڵدایە نێو دوو لاندگرۆزەرەوە ودوو بلدۆزەریشیان کەوتە تەك.ئێدی ئێوارەیەکی

تۆقێنەر بوو کەس نەیدەزانی شێوەی ئەم مردنە چیە تەنها سەرسام بوون نەبێ.بلدۆزەرەکان پێشکەوتن وکاروانە تازە ئۆتۆمبیلەکەش بەرەو ڕۆژئاوا بەرێکەوتن لەبەر تیشکی زەردەپەردا سێبەری دارخورماکان لەرەنگی مردنی ئەوان دەچوو..پاش نیوسەعاتە رێ کاروانەکە بەلای ڕاستدا بایدایەوە سەر رێگایەکی خۆڵ ولەبیابان وتاریکی بەلاوە هیچمان نەدەبینی..هەندێك کەوتنە دوعاکردن پاڕانەوە لەخودا..بەڵام خواش نەهات بەدەنگیانەوە خواش چاوەڕوانی بێ کەس کوژی وئەفسانەکەی دەکرد..زۆرێکیشیان شایەتمانیان دەهێنا..بەهەمان ئەو قورئانەی بەئایەتەکانی ئەوان بەرەو ئەو شوێنەیان بردن...

دونیا خەریك بو هێدی هێدی تاریك دەبوو..کاتیش لەکاتی وادا هیچ مانایەکی نامێنێ..مرۆڤ ئەو کاتە دەچێتە دەرەوەی زەمەن ومێژوو..بەڵام حەسرەتی پێش مردن هیچ وەسفێکی بۆنییە..بەبۆچونی دیلەکان ماوەی ئەوڕاوەڕاوەیە هەریەك بەجۆرێك لەژمارەی دابوو ، یەکێ دەیوت سەعاتێ..ئەوی تر۲۰دەقە..ئەویتر نیوسەعات ، پرسیار لێرەدا ئەمەیە کاتێ مرۆڤ بەرەو مەرگ ڕاپێچ دەکرێت ئیدی کات هیچ مانا وقەوارەو ژمارەیەك نامێنێ..مرۆڤ هیچ پەیوەندێکی بەشوێن وکاتەوە نامێنێ.

لەپڕێکا ئەوەی چاوەڕێی دەکراو نەدەکرا، ڕوی دا..پاسەکە لەناو لمێکدا چەقیو وەستا..ئێدی هەمووشتێك وەستا.هەست..مێشك..کات..شوێن..تەنها لەشکری عروبە وبیابان نەبێ لەکاردا بون هەمیشە..ئەزمونێکی گەورەیان لەگەڵ ئەم جۆرە مردنەدا هەبو.

دوائۆتۆمبیلیش لەکاروانەکەدا بەتوندی بەرەولای ڕاست بایدابوەوە بۆئەوەی خۆی لابدات کەچی ئەویش گیربوو.

عوزێر لەدەلاقەکەی بەینەوە سێ پاسەکەی تر ودوولاندگرۆزەکەی تر ویەکێك لەدووبلدۆزەرەکەی بینیبوو کەدەچنە پێشەوە.

لە نیمچەڕوناکی بەر لایتەکاندا بۆی دەرکەوت کە ئۆتۆمبیلەکان ئەزنەك بەخۆیان دەدەن وبەناو لمەکەدا دەچنە پێشەوە بۆ شوێنێکی نزمایی ماوەی چارەکە میلێك ڕۆیشتن وئەوجا شۆفێر وئۆتۆمبیلیان کوژاندەوە.

لەو کاتەدا هەمو زانی بەرەوفیستیڤاڵی مەرگ لەغوربەتی شەودا دیانکوژن بە شپرزەیی هەمو کەوتە پلان دانان بۆ دەربازبون وپلان دانان ئەگەری ئەوەش کرا کە یەك کەسیش دەربازی بێ شتێکی باشە.

بەندێکان لەناکاو کپ بون..وەك بێدەنگی بیابان هەموشتێ وشك بوو ، کاتێ گوێیان لەدەستڕێژی بەردەوام بوو لەچەکە ئۆتۆماتیکیەکانەوە بەدوایدا بلدۆزەر کەوتە شیڕە وگرم وهۆڕ تەقەکان لەناو جەستە وئێسك وپروسکا دوایی بیست دەقە کپ بون ونەمان! ئەوجا بلدۆزەرێك لەتاریکیەوە پەیدابوو یەکڕاست چوە پشتی پاسەکەی ئەمانەوە چەندجارێك هێزو گوڕی دەدایە خۆی ئۆتۆمبیلەکەی پاڵدەدا بۆئەوەی لە لمەکە دەریبێنێت ئەمجار ویستی لەدواوە پاڵ بنێ بۆدەرهێنانی پاسەکە وعوزێر وای بەخەیاڵدا دەهات کەوا شۆفێرەکە نیازیە یەکڕاست پاسەکە بەماشێنەکەوە بخاتە چاڵێکەوە..

لەدوایدا بلدۆزەرەکە پاسە چەقیوەکەی دەرکرد وشۆفێرە ماندوەکەی دابەزی وماتارە ئاوەکەشی لە لاکەشی دەرهێنا...بەبەرچاوی هەموەوە بەگاڵتە کردنەوە ئاوەکەی خوارد وئەوەشی مابو ڕژاندی بەسەر لمەکەدا.

کاتژمێر۷\۳۰دەقەی ئێوارە ودونیا تەواو تاریکە..بەندیەکی خەڵکی گوندی خدر بەگ هەرچۆنێك بوو توانیبوی لە تۆپزاوا بیشارێرتەوە..دووجاری تریش بەو شێوەی پێشوو ڕێژنەی گولەباران بیسترا ودەنگی قیژە وهاوار بەرز بوەوە لەپاش نزیکەی نیو سەعات هەردوو لاندگرۆزەکە گەڕانەوە لەگەڵ ئەو ئەفسەرەدا

که له پردەکەی سەرفوراتەوە کەوتە تەك کاروانەکە..شۆفێری پاسەکەی عوزێر لەسەر کورسیەکەی دابەزی چوە پشتی ئۆتۆمبیلەکەوە لایتی سەرەوەی دواکەی کوژاندەوە..پاش ئەوەی ئەم کارەکەی کرد وگەڕایەوە بۆ بەشەکەی خۆی لایتی بەرزەکانی تەواو هەڵکرد..بەمە عوزێر وهاوەڵەکانی لەترسا دەلەرزین لەو تارمایەدا سێ دەستە سەرنشینی پاسەکەی تەنیشتی ئەمانیان ڕاکێشا بەبازنەیەك ڕۆشنایی وتاقمی گولله باران کردن یەکسەلەف بەکلاشینکۆف ودەمانچەکانیان دایان گرتنەوە بەگولە دایان ڕژاندن.

ئەوجا گولەبارانکردن وەستا ، گشتیان ڕاکێشانە ناو چاڵێکی تازەوە عوزێر تەماشای کرد هەندێ لاشە هێشتا هەردەجولێنەوە ئێستاش تەنها باری یەك پاس زیندانی ماونەتەوە..پلانی دیلەکان ئەمە بوو:هەرکە یەکەم گارد هاتە ناوپاصەکەوە بۆ بردنی بەندێکان ئەمانە بەهێزترین کەسیان پەلاماری بدات وچەکەکەی لێ زەوت بکات نەیەلێ دەرگاکە دابخرێتەوە..زۆربەیان لەوە لاوازتر بون ئەو کارە ئەنجام بدەن بەڵام عوزێر وعومەر چەند کەسێکی کەمی تر چاویان بڕیبوە سەردەلاقەی خانەی شۆفێر وخانەی دواوە..برایم خۆی بەترسەوە ئامادەکردبو..عوزێر لەکونی بەینەکەوە دووگاردی دەمانچە بەدستی بینی ئەمبەر

وئەوبەری دەرگاکەیان گرت یەکێکی تر کلاشینکۆفێکی بەدەستەوە بوو لەپشتی کوشنی شۆفێرەکەوە ڕاوەستا..لەهەمان کاتدا گاردی چوارەمیش بەکلاشینکۆفێکەوە چاودێری دەرگای دەرەوەی دەکرد قاچێکی لەسەر زەوی ئەویتر لەسەر کەمەی دەرگاکە بو ، پاش ساتێکی کەم یەك لەگاردە بەرگە نزامیەکان کە پیاوێکی کەتەی مل ئەستور تەختەکەی نێوان خانە شۆفێر وخانەی دواوە لابرد هەرکە ئەمەی کرد بەندیەك ناوی سەلام بوو شەقێکی بۆ داهێنایەوە لێیبدات بەڵام گاردی پشت شۆفێرەکە بەر دەمانچەی دا هەر لە جێدا سەلامی کوشتو بەتوندی دەرگاکەی داخستەوە.عوزێر گوێ لەوە بوو کە ئەفسەرەکە جاڕی ئەوەی دا کە دیلەکان یەك یەك بکوژرێن.

عوزێر کە جڵەوەی وەزعەکەی گرتبوە دەست ڕایسپاردن کە چی بکەن ئەویش ئەوە بوو ئەگەر ئەمجارەیان گاردەکان هاتن یەکەم بەندیان بردە دەرەوە عومەر بەهەمو قورسایەکەوە خۆی بدات بەسەر گاردەکەکەدا و نەیەڵێ دابخرێتەوە.ئەوانەی تریش هەر هەموو پەلەقاژە بکەن نەیەڵن دابخرێتەوە پاشان بەحوکمی زەرورەت ئەمە ڕوی دا.

گاردە کەتە وزلەکە گەڕایەوە دیلێکی کێشکردە ناو دەرگا کراوەکە بەپارچە پەڕۆیەکی سپی چاوی بەستەوە هەرکە ویستی

بیبات بۆدەرەوە شەش تاحەوت بەندی پریان پێدا کردو یەك دوانیان قایشی کلاشینکۆفەکەیان توند گرت هەرلەو کاتەشدا ئەو قوناغ ولولەی تفەنگەکەی توند گرتبو بەرینەدەدا عوزێر هاواری لەبەندیەکی تر کرد کە بکێشێتە ناوچاوی ئەفسەرەکە..هەر بەپێنج کەسەوە بە هاوارەوە کێشایان بەناوچاوی گاردەکە وعوزێر چەکەکەی لێ سەند بەڵام ئەفسەرەکە میلەکەی شکاندبوو شانەی فیشەکەکانیش دەرهانیبوو لەپاسەکە توری دابوە دەرەوە.

بەندێکان بەجارێ تێرژان وبەپەلەقاژە چونە دەرەوە یان بوو کەوا بەکراوەیی مابوەوە رێگەی دەربازبونی گاردی پشت کوشنی شۆفێرەکەیان بریبوو، لێرەدا رێژنەی گولە لێیان کەوتە کار ودووکەسیان پێکران وکەوتن بەسەر عوزێردا یەکێکی دی ویستی خۆی هەڵبدات ئەویشیان بەگولە خستە خوارەوە عوزێر لەو کاتەدا لەهەوڵی دەربازکردندا بوو یەك لەچوار گاردەکەی بینی ئەوەی کەسەلامی کوشتبوو خەریکە بەسەر ئەمدا بکەوێت وخوێنێکی زۆر لەشانی دەڕوا کابرا هاواری کرد((ابو سالح ڕاکە فریام کەوە))وادیاربوو لەلایەن خۆیانەوە پێکرابوو..عوزێر دەستی بۆ دەمانچەکەی برد ونەیدۆزیەوە باوەشی پێدا کرد وبەسەر شانە برینداەرەکەیدا دای بەزەویدا وکابرا هەڵنەستایەوە دیاربوو

لەهۆشی خۆ چووبوو ، لەم کاتە سەرباز وپۆلیسەکان ئەم سەر وئەوسەری پاسەکەیان بەر دەستڕێژی گولە دەدا وخەڵکەکەش بەجارێ تۆقیبون خۆیان کردبوە ژێر کورسیەکانەوە لەناو پاسەکە لاشە بەسەر یەکا کەوتبو گوللە سمتی برایمی پێکابوو..لەو هەرا وزنایەدا هەچونێك بوو عومەر خۆی خزاندە ژێر ئۆتۆمبیلەکەوە لەکاتێکا گوللە ئۆتۆمبیلەکەی دادەبێژا..پارچەیەکیش کەمێك ڕانی عوزێری بریندار کردبوو..لەو شوێنەدا کەڕاکشا بوو لەنێو دەستڕێژی گولەدا دەنگێکی نامۆ دەهاتە گوێ یەکەمجار نەیزانیبوو چیە - بەڵام دواجار زانی ئەمە خوێنە ولەپاسەکەوە دەچۆڕێتە خوارەوە چونکە هەمو بەندێکانی هاوڕێ کوژرا بون.

پاش ئەو مەرگەساتە هەرچونێك بوو عوزێر خۆی لەتاریکیدا ونکرد ، بەتۆرەیی و پەشۆکانەوە ڕایکرد وپاش تۆزێك کەوتە نێو چاڵێکەوە بەسەر لاشەیەکدا ڕما کە خوێن لەلوتیەوە دەهات بەڵام هێشتا هەر هەناسەی دەدا.

ئەم چاڵە زۆر جیاوازبوو لەوەی کە مستەفای تیدا کەوتبوو بۆ ئیعدام کردن.ئەم چاڵە بەمەزەندەی عوزێر ٤٠٠ لاشەی تێدابوو..عوزێر لەترسی ئەوەی نەزانرێ کوردە جلەکانی لەبەر خۆی داکەندبوو لولی کردبوو خستبویە سەر شانی ماوەی چەند سەعات بەڕاکردن ڕۆیشتبوو..عوزێر دەڵێ:من تەنها بەوچاڵانەدا

تێپەریم کە پڕبون لەلاشەو بەبۆندا دەمزانی لە کوێدان هەروەها کۆمەڵە خۆڵی زۆرم بینی شۆفل بەرزی کردبونەوە.

عوزێر لەجادەیەکی قیر پەڕیبووەوە گەیشتبوە سەرئاوێك ڕەنگە دەریاچەیەك بوبێ لەوبەریەوە تارمایی درێژدرێژی دارخورمای بەدیکردبوو لەوێ لەسەر ئاوەکە چۆکی دادابوو بۆئاو خواردنەوە بەڵام لایتی ئۆتۆمبیلێك کەنزیك دەبوەوە ترسابوو یەکێك لەلاندکرۆزەکانی تاقمی ئیعدام کردنەکان بێ ، خۆی فڕێدابوە نێو ئاوەکەوە کاتێ لەئاوەکە هاتبوە دەرێ ئۆتۆمبێلەکە بەلایەکی تردا چووبوو.

عوزێر لەدورەوە ڕوناکی دەبینی بەرەوڕویان دەچێت ، ئەوکات کاتژمێر لە چواری بەیانیدا دەبێ دواجار ئەویش چوبوە هەمان ئۆردوگایەی مستەفای بۆ ڕۆشتبوو، عوزێریش دواتر زانی نیشتەجێ هەزاران کەسە لەخەڵکی ناوچەکانی قەسری شیرین کەوا لەسەرەتای جەنگی عێراق وئێرانەوە گیرا بون..کۆمەڵگایەك بوو چواردەوری بە تەلی دڕکاوی گیرابوو دانیشتوانی نەدەبوو بچنەدەرەوە لە مۆڵەتی هەشت سەعات بەولاوە کە ڕۆژانە ڕێگەیان دەدرایە لەبازاڕی رومادی پێویستی خۆیان بکڕن.

لەبەرەبەیانیەوە لەو ئۆردوگایە عوزێر ماڵ بەماڵ گەڕابوو وپاڕابوەوە تاپیاوێك کەناوی ئەحمەد بوو دڵی پێ سوتابوو

بردبوی بۆ گەراج سواری پاسێکی بچوکی کردبوو بۆ ڕۆمادی لەپاسەکەدا مستەفای بینی ئەوجار هەردووکیان تا گەراجی بەغدا رۆیشتبون لەوێ مستەفا بەبۆچونی خۆی ئەفسەرێکی ئیستخباراتی ناسیوەتەوە کە لەتۆپزاوادا بینیبوی لەترسا ڕایکردبو وخۆی لەقەرەباڵغی گەرەاجەکەدا ونکردبوو لەدوایدا عوزێر گەیشتبوە گەڕەکی کوردەکان لەکەرکوك..ئەو شەوەش تەماشای تەلەفزیۆنی کردبوو خۆی لەراپۆرتە هەواڵێکدا بینی بوو کە سوپای عێراقی پشانی د ەدا چاودێری ئێرانیە گیراوەکانی دەکرد ئەو فیلمەی لە١٠ینیساندا لەبنکەی پۆلیسی قادرکەرەم تۆمارکرا.

لەبەسەر هاتی تەیمور ومستەفا وێنەی هەزاران ڕوداوی وا لەچاڵەکانی ئەو بیابانە کە بۆلاشەی میلەتێك ئامادەکرابوو دەبینینەوە.ئەم ڕوداوانە لە گێڕانەوەدا بۆ کەسانێك هەرلە ئەفسانە دەچن..بۆیە گێڕانەوەی چیرۆکەکانی خواروی ڕۆمادی وتۆپزاوا وعەرعەر ودەشتی موسڵ بەشێ لەمێژوی کوشتارەگەورەکانی نەتەوەی کورد کە نەتەوەکەی خۆیشی دۆستی خۆی نیە ، دەستی هەبوە لە ئەنفالکردنی .

دیلەکانی ئەم جەنگە سەرتاسەریە دیلی لەناوبردن بون ، بەو نیازەی گوندە دورەدەست بەرهەڵستکار ویاخیەیکان ئامانجی

یەکەم وسەرەکی جینۆسایدکردنەکە بون کوردەکانی ناوشاریش لە پرۆژیەیەکی لەناوبردنی نەڕاستەوخۆی تردا..وەکو ڕاگواستن وتەعریب کردن وگۆڕینی شوێن وتێکەڵبونیان لەگەڵ زمانی تر بەشێکی تری پرۆژەکە بون کەئەوکات صدام بەشێوەیەکی جەهەنمیانە بۆقڕکردنی نەتەوەیەك هەموداموەزگاکانی خستبوەکار ، بەڵام ئەوانەی گوند وچیاکان تەواو صەدامی بێزار وبێقەرارکردبوو لەشەهامەتی خێڵ و نەرسیسی ئەم پیاوە عەرەبەی دەدا کە هیچ شتێکی لەسەروی خۆیەوە قبوڵ نەدەکرد..غرور بەئاینەکەی غرور بەدسەلات ونەتەوەکەی بەو سامانەی کەوتبوە ژێر دەستی ئەمە جگە لەو لەشکرەی کە لەو سەردەمەدا چوارەمین هێزی دونیا بون.

هەمو ئەم دیاردە وبەڵگانە ڕاستی ئەوە دەردەخەن کەصدام بەپیس ترین شێوە دیلەکانی لەناودەبرد وەك ئەوەی کۆمەڵێك وجرِوجانەوەر،بێ باك وبێ بەزەییانە لەناو ببات ، چیرۆکی تەیمۆریش یەکێکە لەو کەسانەی لە ئووستورەی مردنی ناوسەرابەکان رزگاری بوو ئەمە جگە لەمردنی ئەو پیرەپیاو ومناڵانەی لەعەرعەر لەبەر قورسایی ستەمکاری ئەو دۆزەخە مردن وبۆنە خۆراکی سەگ وژووژوو گەلە گورگەکان.

گەورەترین پرسیار لێرەدا ئەوەیە..کەکورد خۆی چی وەك نەتەوە چی وەك بزوتنەوەی چەكداری وسیاسی كوردی بەشێك بوو لەوپرۆژە دۆزەخیە..بۆ ئەوەی تۆزقالێك هەڵوێست نیشاندا جگە لە بێ باكی ودڵڕەقی..دیارە ئەمەش قسەی تری لەسەر دەكرێ كەپیویستمان بەباسی ترە لەسەر تەوەری تر كەبۆئەم حاڵەتە سایكۆلۆژیە بشێ.لەدوا بابەتی باسەكەش دێمە سەر رۆڵی بزوتنەوەی چەكداری كوردی وفەوجە جاشەكانی كورد كەنزیكەی ٢٥٠ هەزار چەكداردەبون بۆ لەناوبردنی میلەتی خۆیان بەكارهێنران.چیرۆكی ئەنفالەكان ئووستورەی عوزێر وتەیمور ومستەفاوئیبراهیم بەرلەوەی دیلی دەستی عروبەبن دیلی دەستی هەڵچەوت وسیاسەتە گۆمانلێكراوەكانی بزوتنەوەی كوردین.لێرەدا بابزانین تەیمور چی دەگێڕێتەوەلەوسەدان هەزار چیرۆكەی كە لەبیابانەكاندا بونە سەراب.

تەیمور خەلكی گوندی كوڵەجۆ بوو لەساڵی١٩٨٨تەمەنی دوازدەساڵان بوو لەهێرشی سوپای عەرعەرێكان وكورانی جەزیرەی عەرەبی لەگەرمیانی خوارو كوڵەجۆ كەوتە بەرشاڵاوەكە ناچار بەرەو ملەسور هەڵاتن..پاشان ملەسور بوە شوێنێكی گرنگ لەكۆكردنەوەی ئەنفالەكانی ئەودەفەرە..دوای كۆكردنەوەیان وگواستنەوەیان بۆ قەلاكەی قۆرەتوو دوایی دەرۆژ هەمویان بران

هەمویان بۆسەربازگەی تۆپزاوا گواسترانەوە لەوێ ئیدی رۆژی حەشرو بریاردان بوو لەسەر شێوەی کوشتنی بەکۆمەڵ دەست بەدەست کاروان بەکاروان جێگا بەجێگا دەدرانە دەست سەراب ووەك دیلیك کەسنازانێ شێوەی ئەم دیلانە چین کە لەسەدەی بیستدا بەدەستی دەسەڵاتی سەردەستی عەرەب قڕکران.

تەیمور بەم جۆرە ڕوداوەکە دەگێڕێتەوە.

رۆژێکی ئاخر وئۆخری مانگی مایس کاتژمێر دەوری ٦ی بەیانی گاردەکان تەیمورو دایکی وخوشکەکانیان دەرکردە حەوشە وناوەکانیان لەلیستێکدا ئیشارەت کردن.کاروانێکی ئۆتۆمبیلیش ڕێك لەوجۆرانەی کە لەپێش مانگێکدا مسەتەفایان پێ گوزرابونەوە بۆ رومادی چاوەڕییان دەکردن..ئۆتۆمبیلەکان ڕەنگیان سپی یان سەوز بوولە بەرئەوەی بێ پەنجەرەبون تەیمور بەئەمبوڵانسی گەورەی دانابون..لەهەر پاسێکدا پەنجا یان شەست منداڵی ژماردبوو کە لەسەرچوار تەختەکەی ناو پاسەکەدا دانیشتبون بەندێکان بۆئەوەیبچنە ناوخانەی سەرنشینانەوە بەدوخانەی بچوکی پاسەوانیدا کە لەناوەوە دەرگایەکیان بەین بوو تاتێپەڕن.گاردەکانی تر لەپێشەوە لەگەڵ شۆفێرەکەدا سەرکەوتن تاقەدەروی هەوا گۆرینش کونێکی بچوك بوو.لەدواوە تەیمور نەیدەتوانی دەرەوە ببینێ.

پاشان تاخۆرئاوا ئاوا بەسەر رێگایەکی قیردا رۆشتن وەتەنها یەکجار وەستابون..لەناو ئۆتۆمبیلەکە تەیموریان بەرزکردبوەوە بۆ ئەوەی لەکونی هەوایەکەوە تەماشا بکات.بەلآم هەمو ئەوەی لەجێگەی وەستانەکەیاندا بینی تانکییەکی گەورەی ئاو بوو کە بەبۆیە پەڵەپەڵە کرابوو..گەرمایەکی لەڕادە بەدەر دەرگاکان هەربەداخراوی ماونەتەوە دلۆپێك ئاو نەبوو ئەوحەشامەتە بیخواتەوە.کاتێ پاسەکان بەرێکەوتبون سێ منداڵ هاتبون بەلادا ومردبون هەرسێکیان لە تەیمور منداڵتربون،بەمەش هەر نەوەستاون وکەسیش ورتە لەدەمیەوە نەهاتبون وتەنها مەرگ کاری خۆی دەکرد.تەیمور دەڵێ:_خەڵکەکە بەجاری لەترسا بڕابون وماندو پڕوکاو تینوو لەوپەڕی نائومێدابون.کاتێ کاروانەکە وەستا شەو داهاتبوو..گاردەکان بەندێکانیان بردە دەرەوە...تەیمور لەوتاریکیەدا هیچی نەدەبینی،لەبیابانێکی بێکۆتای بەولاوە ، بەلآم توانیبوی نزیکەی سی ئۆتۆمبیل لەکاروانەکەدا بەدی بکات ، دەستە دەستە سەربازیش لەوناوە داسوڕاونەتەوە دیاربون لەتەك لاندگرۆزەکانیان لەتەك پاسەکان هاتبون.

ئەوجار لەمەتارەکانیان کەمێك ئاویان داوە بەبەندێکان وپاشان چاوی هەریەکەیان بەتیلماسکێك پەڕۆی سپی بەستوەتەوە لەبەر

ئەوەی بەسەدان خەڵکی لێبوە کارەکە وەختێکی زۆری گەرەك بووە بەبۆچۆنی تەیمور نزیکەی سەعاتێکی خایاندوە کاتێك تەواو بوە دیسانەوە خەڵکەکەیان سواری پاسەکان کردوەتەوە تەیمور دەستبەجێ پەڕۆکەی سەرچاوی کردوەتەوە.لێرەوە بەهەلبەزو دابەزی پاسەکەدا زانیبویان کەوا لەرێگای سەرەکیەکە ترازاون ورێگایەکی خۆلیان گرتوەتەبەر بۆناو بیابان.

لەپاش نیوساعاتێك پاسەکە دیسانەوە وەستاوە وگاردەکان خۆیان هەڵداوەتە خوارەوە دەرگاکانی پشتەوە یان کردوەتەوە تەیمور تەماشای کردبوو کەوا هەرئۆتۆمبیلیك رێك بەرانبەر ئەوچاڵەی خۆی وەستاوە کە بۆ ناشتن ئامادەکرابوو..هەریەك لەم چاڵانەش نزیکەی پانزە پێ چوارگوشە پان وکەمتر لەیاردیك قوڵ بوە،لەپشتی هەر چاڵێکیشەوە گردۆڵەکەخۆلێکی تازە هەڵدرابوە گاردەکان بەزۆر بەندێکانیان پاڵناوە بەلێواری چاڵەکان وتەیموریش لەترس وحەپەساندا لەدایك وخوشکەکانی دابڕاوە،هەر دەستە بەجێ ئەفسەریك وسەربازیك بەکلاشینکۆف کەوتە گولەباران کردنیان، چەپی تەیمور پێکراوە بەدەم ئازارەوە هەنگاوی بۆلای ئەو سەربازە هەڵهێناوەتەوە کەتەقەی لێکردبوو لەم ساتەدا تەیمور وەك دێتەوە یادی سەرنجی دابوو کابرافرمێسك لەچاوی دێتەخوار بەڵام کەتەیمور پەلەقاژەی ئەوەی کردوە

دەستی پێوە بگرێ لەچاڵەکە بێتەدەر،ئەفسەرەکە قیڕاندبوی بەسەریدا بەعەرەبی فەرمانێکی دابوویە وسەربازەکە بەرگوللەی دابوو..ئەمجارەش گوللەیەك لای ڕاستی تەیموری گرتبوو ڕێك لەژووی کلۆکیەوە خپ خستبووی.

لەپاش ئەنجام دانی کارەکەیان سەربازەکان ڕۆشتبون،تەیمور لەتاریکیدا نەیبینیبون بەڵام گوێی لەدەنگیان بووە هەرلەوکاتەدا هەستی بەجوڵەیەك کردوە لای خۆیەوە تەماشای کردوە کچێکی منداڵە ولەوە دەچوو گولەی بەرنەکەوتبێت ، بەئەسپایی پێ وتوە..باڕابکەین..کچەکەش لەولامدا وتبوی(..ناتوانم زۆر لەسەربازەکان دەترسم..)تەیموریش بێ ئەوەی زیاتر لەسەری بڕوات خێرا بەکۆمەڵە خۆلی پشت گۆرەکەدا هەلزنابوو..دواتر هەواڵێکی بیستوەتەوە کەواکچێکی کورد لەبیابان بە زیندوی دۆزراوەتەوە لەوکاتەدا وایبۆچوە کەهاورێکەی بوبێت لەچاڵەکەدا بەجێهشتبوو..بەڵام دایکی وسێ خوشکەکەی لەگولەباران کردنەکە دەرنەچون.

تەیموریش وەك کچەکە یەکەمجار زۆردەترسا ڕابکات چونکە لاندگرۆزەکان هێشتا هەر بەدەوری شوێنی ئیعدامکردنەکە دەسورانەوە لایتەکانی پێشەوەیان تاریکی ئەوناوەیان

دەڕەواندوە.تەیمور گردۆلکە خۆڵەکەی تۆزێ هەلدڕیبو خۆی تیامات کردبوو.

هەرکە ڕوناکی لایتەکان لەگوزەرەکەی دەردەکەوتەوە خۆی بەکێش دەکات بۆچاڵێکی تر تابەولایەدا گەیشتە دواین چاڵی پڕ لەلاشە ولەدوایی ئەوەئیتر چاڵەکان بەتاڵ بوون ، کەدەگەیشتە هەریەکێکیان خۆی بەبنی کۆمەڵە خۆڵەکەوە دەنووساند ، بۆ ئەوەی بەدینەکرێت،پاشان هەستی بەوەکردوە کەزۆر درەنگە واپێنجەم یان شەشەم کۆمەڵە خۆڵ تێدەپەرێنێ هێشتا هەرخۆێن لەزامەکانی دەروات.بەلام تەواوی ئەوناوە وائێستاکپ و بێدەنگە..پاسەکەداخراو لاندگرۆزەکان ڕۆشتون تەنانەت تەیمور گیوی لەدەنگی هیچ بلدۆزەرێکیش نەما..کەواتە ئەوچالانەی لاشەی قوربانییەئیعدامکروەکانی ئەوشەوەیان تێدا بووە خۆڵیان بەسەردا دراوەوتەختکراون..هیچ تەرمی تازەی بەدەرەوە نەماو تەیمور لەهەلاتنیدا بەنێو تاریکیدا بیست چاڵێکی بە تالی دیکەش تێپەڕاندوە..ئێستادێتە یادی کەئەودەمەی لاشە بریندارەکەی خۆی بەکیش دەکرد ولەشوێنی کوشتارەکە دووردەکەوتەوە تەنها بیری لەیەك شتدەکردەوە.

((گەر بەسەلامەتی رزگاربیم مەرج بێ پێنج دینار بکەمە خێرو بیدەمە هەژار))مانگ بە ئاسمانەوە نەبوو تەنها جارێ لایتی

ئۆتۆمبێلێك لەپشتیەوە لە دووربینی ئەوجار گەیشتە دوڕیانێکی خۆڵی کوێرانە یەکێکیان گرت ورۆیشت لەپاش سەعاتێك ڕێکردن گەیشتە ئاقاری چەندمالێکی ڕەشمال نشینی بەدوو..سەگەل کەوتنە وەرین ودەنگ وهەرا خاوەنی نزیکترین خیۆەتی وە ئاگا هێنا وبەلایتێکی دەستیەوە سەری کێشاو مێرمندالێکی بە بەرگی کوردیەوە بینی کەوا سەرتاپای خۆێن بوو ، ڕاکێشایە ژوورەوە ئەوان نەیاندەتوانی لەیەکتر تێبگەن نەبەدوەوەکە لەکوردی دەگەیشتو نەتەیموریش وەشەیەکی عەرەبی دەزانی..کابرا نەیتوانی هیچ شتێك بکات بۆچارەسەرکردنی برینەکانی تەیمور،ئەگەر چی زۆرکاریگەریش نەبون ژیانیان خستبوە مەترسیەوە ، ئەوپیاوەی ماوەی ٣ رۆژ لەخیۆەتەکەیدا شاردیەوە پاشان بەپیکابەکەی خۆی بردبووی بۆنزیکترین شار ،بۆسەماوەی باشوری بەغدا کەدوا قۆناغی وەستانی کاروانی ئەو خەلکە پیرو نەخۆشەبوو کە دەبران بۆ نوگرەسەلمان، تەیمور لەوێ مایەوە وماوەی دوو ساڵ خێزانێکی عەرەبی خێرخواز وبەبەزەیی دالدەی داوشاردیانەوە.

دەرئەنجام خێزانەکە بەکەسانێکدا کەوا کەوتبونە بەینەوە.بەنهێنی هەواڵیان بۆ مامێکی دەربازبووی تەیمور ناردبوو لەکەلار کەوا کورەکەیان زیندوە لەبارودۆخێکی باشدایە

لەئۆکتۆبەری ساڵی١٩٩٠ تیمور ومامەکەی گەیشتنەوە یەك، ساڵی دواتریش پاش ڕاپەرینە سەرنەکەوتوەکەی کورد چیرۆکی تەیمور لەملاو ئەولا بلاّوبوەوە بۆیەکەمجار ئاوڕی ڕاستەقینەی جیهانی دەرەوەی پێدایەوە لەئەنفال کەچەند تۆقێنەرو ترسناك بوە.

ئەوەی کەجێ وەبیر هێنانەوەیە ئەم مەرگەسات وقڕکردنە لەبەر چاوی هەمو دونیا بەڕیوەچوە ئەوسەردەمەش دۆستە بێئەخلاقەکانی ئەمڕۆی کورد لەئەمریکی وئەوروپێکان ورۆژهەلاتی ئاسیا ئەوپەڕی پەیوەندی سیاسی ودیبلۆماسی وکولتوریان لەگەڵ یەکێك لەپیسترین جەلادەکانی دونیاهەبوە ، وبۆ تۆزقالێکیش چیە نەئاوڕیان لە کورد دایەوە نەخەمی ئەومەرگەساتەشیان کردە هەلّویست..جگە لەمەش ڕێکخراوی تۆپیوو بێ هەلّوێستی ماف مرۆڤ وەك هەمو ڕێکخراوە بودەڵەکانی جیهان تەنها لەوکاتانە دێن..کەخوانی چەورو پاروی بێ شوماری تیا بێ..سیاسەتی نەتەوەیەکگرتوەکان وتەواوی دونیاش وەك نەریتێکی هەمیشەی وئەزەلی ڕۆحی سیاسەت هیچیان بۆ کورد نەکردو..تاج وشەرەف سیاسەتیان لەسەرخۆیان دانا وهەرهەموشیان ئاگاداری وردودرشتی روداوەکانی عێراق بون..بەلاّم لەکوێ لەچی شیونێکی دونیا ملیۆن کەلەسەری ئینسان تاقە دۆلارێکی بەرژەوەندی سیاسەتی هێناوە..لەکاتێکا ئەم کارەساتە دەنوسم هەتا ڕۆژی

قیامەت ئەگەر هەبێ لەعنەت هەزار لەعنەت لەتەواوی سیستمە سیاسیەکانی جیهان‌و رێکخراوەکانی مافی مرۆڤ...کە هاتنی ئەمرۆشیان بۆ گورە بەکۆمەڵەکان نیە..من لەخوارئاوا ئەوەم بۆدەرکەوت کە سیستمی جیهانی نوێ رێکخراونەتەوە بەناو یەککگرتوەکان ومافی مرۆڤ تەواوی دام ودەزگاکان جگە لەمەلهاخانەیەکی سیاسی بۆ کۆکردنەوەی سامان هیچی تر نیە !.

# بەشی سێهەم

❖ بنەما تیۆریەکانی فارەمانپەرستیو مێگەلپەرستی

❖ بزوتنەوەکانی فاشیزمو تۆتالیتاریزم لە دونیای هاوچەرخدا

❖ بزوتنەوەی تۆتالیتێر

❖ دەسەلات وتۆتالیتاریەت

❖ قۆرخ کردنی گشتی

❖ تۆتالیتار وەك سیستەم

# بنەما تیۆریەکانی
# قارەمانپەرەستی و مێگەلپەرەستی.

نیچە پێی وایە لەو رۆژەوەی کە مرۆڤ هەبوە ڕانە مەڕیش هەبون و بەهەمان شێوەش ژمارەیەکی زۆر لە فەرمانپێکراون لە بەرامبەر فەرماندەکاندا پێویستی مرۆڤ بە ملکەچی ئەوەندە بوەتە شتێکی خۆڕسك ئیدی ئەم پێویستیە لە پێگەی ویژدانێکی ڕەسمیدا حوکمی کردوە..دەبێ تۆ بێ ئەملاوئەولا ئەمە بکەیت ئەوە نەکەیت لە ئەنجامی ئەوەشەوە غەریزەی ملکەچی بەکۆمەڵی بەمیرات بۆ مرۆڤ مایەوە کە خۆشەوستی بۆ هاوچەشن لە چاوترسی لە هاوچەشن ببێتە شتێکی لاوەکی بەم پێەش ئەخلاقی ڕانەمەڕی و ئەخلاقی ترسنۆکی ئامانجی خۆی بەدەست هێنا.

لەم بەشەدا هەوڵ دەدەم بنەما سەرکیەکانی قارەمان پەرەستی و مێگەلپەرستی بخەینە ڕوو هەروەها سەرچاوەی ئەو تێزە فکریانەی لە سەدەکانی ڕابردوودا بۆ شێوە کۆمەلگایە خرانە ڕوو ئاشکرا بکەین و پەیوەندیان بە ڕوداوەکانی دونیا و بە تایبەت بە پرۆسەی ئەنفالەوە.

لێرەشا پەنا دەبەمە بەر چەمکی قارەمان و ڕەگەزپەرەستی.(کارلایل وگۆبینیۆ)تا لەو ڕێگەیەوە لە ڕۆحی پیاوی کاریزمی و ڕۆڵی ئەم زاتە لە داڕشتنەوەی کوشتارە گەورەکانی بەشەری و ناعەدالەتی و کێشە ئاڵۆزەکانی مرۆڤایەتی بەدیار بخەین.هەروەها ڕۆحی فاشیەت و کەسی موقەدەس ولە ڕێگەی خوێندنەوەکانەوە ئاشکرا بکەین کە تاچەند ئەم دوو چەمکە بەڕۆحی کەسایەتی وسیاسیە دیکتاتۆرەکانی ئەم ناوچەیە و بەشەکانی تری دونیا لە قۆناغە جۆراوجۆرەکانی مووتر بەکراون و ڕەنگیان داوەتەوە.

مارکسیەکان لە وڵامی چەمکی فاشیزم دەڵێن:فاشیزم دەرئەنجامێکی حەتمی سەرمایەداری بو وڵامی چینی مامناوەندی داڕۆخاو بەهۆی لە دەستدانی بازاڕی وڵاتە داگیرکراوەکان لە دەرەوە و گوشاری پرۆلیتاریای شۆڕگێڕ لە ناوەوە بو.

بناغەی وەها ڕاڤە کردنێك لەلایەن لینینەوە لە نوسینەکانیدا دەربارەی ئیمپریالیزم داڕێژرا،مارکسیەکان لە دەیەی بیست و سیشدا ئەم بوچونەیان گشتاند،تایبەتمەندی ئەم ڕاڤەکردنە لەوەدایە کە ساویلکانەیە.

هانا ئارنیت،لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆی،سەرچاوەکانی تۆتالیتاریزمدا جەخت لەسەر ناواخنی نائەقڵانی نازیزم دەکات وە

سەرچاوەکەی دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی کە مرۆڤی مۆدێرن لە کۆمەڵگای پیشەسازی کەوتوەتە سەر دووڕیانێك، بە بۆچونی ئەو تەنیا لەخۆنامۆبونی گەلێکە کە ناسنامەی چینایەتی و بوارەکانی پەیوەندی خێزانیان لە دەستداوە ئەودالّی ئاسایشی دەرونی ڕۆحین کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی بەئاسانی ببن بە خۆراکی بزوتنەوە سیاسیە قورخکارەکان..یەکێك لە تایبەتمەندترین کایەکانی فاشیزم نکۆڵیکردن بو لە ئارمانجە مرۆڤ دۆستانەکان بەتایبەتی بیری یەکسانی بە زەبری گشت مرۆڤەکان بوو.تێڕوانینی جیهانبینی فاشیزم بە شتێکی پێویست دەزانی،بەڵکو ئەوانەی بە بەهای خۆی دەزانی،بیرۆکەی ڕۆمانسی برایەتی کارپێکراوی لە فاشیزم ئەم تایبەتمەنیانە دا قەرەبوو نەدەکردەوە،چونکە برایەتی فاشیزم لە برایەتی خود بەدەستەوەداندایە،تایبەتمەندی فاشیزم جەخت کردنە لەسەر توندوتیژی کە لە ڕادەی شوناسی بە جێ گرنگی توندو تیژی لە سیاسەت ڕەتدەبێتەوە بەربەستە عیرفانیەکەی دەگۆڕێت ، لەفاشیزمیدا خوێن و مەرگ سەرنج ڕاکێشەیەکی شەهوەت ڕانی دەستەبەر دەکەن..وایس یەکێکە لە مێژونناسانەی بڕوایان وەهایە فاشیزم کاردانەوەی زەبروزەنگ ئامێزی تاقمە نەریتپارێز

و کۆنەخوازەکان بەرامبەر بە بەهاکانی جیهانی مۆدێرنە.وایس لەم خاڵانەی خوارەوە فاشیزم پێناسە دەکات.

لێکدانەوەی ئۆرگانی لە کۆمەڵگا(واتا هەمان لێکدانەوەی کە رۆمانسیێکان دەربارەی کەسانی وەکو هێگڵ و مارکس هەبو.

١_ئایدیالیزمی فەلسەفی

٢_بە ئارمانجکردنی خەسلەتە (پیاوانەکان)کە خەسلەتەکانی جوتیاریان گوندنشینە.

٣_دوژمنایەتی کردنی سەرمایەداری پێشکەوتوو

٤_سوکایەتی کردن بە دیموکراسی

٥_لێکدانەوەی دەستبژێرانە لە رێبەری کۆمەڵایەتی و سیاسی

٦_نەتەوە پەرەستی و گەلێ جار بەڵام نەك وەکو پێویست جولەکە کوژی

٧_ملیتاریزم

٨_پاوان خوازی

فاشیزم بروایەکی ئاینیە کە تێیایدا مرۆڤ خۆی لە پەیوەندیەکی نزیك لە گەڵ ویستێکی بەرچاو باڵاتردا دەبینێت،ئەم پەیوەنییە بەرزی بە بونی تاکایەتی و کەمی ئەو دەبەخشێت و پێگەی بە ئەندامبون لە تاقمێکی یەزدانیدا بەرز دەبێتەوە.

مۆسۆلۆلینی دەلێ:_(ئێمە خوازیاری ئەو جۆرە ژیانەین کە تاك لە ڕێگەی قوربانی دان بە بەرژەوەندی تایبەتی خۆی لە ڕێگەی مەرگی خۆیەوە،ئەو بونە ڕۆحانیە پۆختەیە بە دی بهێنێت،کە بەهاکەی لەوەدایە وەکو مرۆڤێك بە یەکێك لە دروشمە بەناوبانگەکانی فاشیەکانی ئیسپانیاش ئەمە بو:(بمرێت ئەقڵ،بژی مەرگ)!

ئەمانە هەر هەمویان جۆرێکە لە شەرعیەتدان بە قارەمان و کوشتنی مرۆڤ و ڕێگە خۆشکەرە بو کەسی کاریزمی و دەسەلاتی فاشیانە.

کارلایل لە بیست و دووهەمی مانگی مایسی ١٨٤٠دا،وتارەکانی خۆی لە ژێرناوی(دەربارەی قارەمانان و قارەمان پەرەستی کارە قارەمانیەکان لە مێژودا دەست پێ دەکرد،لە بەردەم ژمارەیەکی زۆر کەسایەتی ناسراودا موتعەی دەکرد..کۆمەلێك لە نەجیبزادەکانی لەندەن هاتبون تا گوێ لە وتارەکەی ئەو بگرن،ئەم وتارە ئامادە بوانی هەژاند بەلام هیچ کەسێك نەیدەتوانی پێشبینی بکات ئەم ڕوادوە کۆمەلایەتیە بە دەرهاوێشتەی سیاسی گەورە ئاوسە.

لە بەرهەمە نوێکاندا مەیلێکی نوێی هەیە کە تیۆرەکانی کارلایل بەرپرسە سیاسیەکانی ئەمڕۆمانەوە دەبەستێتەوە،واتا

کارلایل لە زومرەی ئەو کەسانە هەژمار بکەن کە لە ڕێگەی پەیڕەوی فاشیزمدایە.

ئێرنست سیلەر لە ساڵی ١٩٣٩کتێبێکی دەربارەی کارلایل خستەسەر پێرستی دوور و درێژی کتێب...ئەو بابەتانەی دەربارەی فەلسەفە و ڕەگەزنامەی ئیمپریالیزمی مۆدێرن خوێندبویەوە.

سیلەر پێی وایە:_کارلایل هەرچی زیاتر دەربارەی وانەکانی ژیان و خەسلەتی ڕاستەقینەی جەوهەری مرۆڤ تێڕامانی دەکرد،زیاتر مەیلی بەلای نەریتپارێزیدا دەڕۆشت وە لە نێوان نوێنەری خودای مەزن وە لەسەر زەویدا شوێنی زیاتری بە سیاسەتمەداران وسەربازەکان دبەخشێ،ئەمە لە هەڵگەڕانەوەی ڕۆمانسیەتی ئەلمانیدا مەیلێکی پرۆسی هەبو ، بەپێی ئەم بوچونە بە پرۆسیای بونی ڕۆمانسیەتی کارلایل هەنگاوێکی بنبڕ و کۆتایی بو،بۆ ئەوێ پەلکێشی کرد کە پێگەی خودایی بە ڕێبەرانی سیاسی ببەخشێت و ڕەواو ناڕەوا بە یەك بزانێت کارلایل دەڵێت:_پەرەستنی قارەمان ستایشی دڵسۆزانە و بە ئەمەکانەوە خۆ بەدەستەوەدان دڵسۆزی یەکجاری زۆر لە بەرامبەر بەرزترین مرۆڤی خودائاسا،مەگەر ئەوە میکرۆبی خودی مەسیحیەك نییە.

له کتێبی سارتۆر ڕساتۆردا دەڵێ:_دیالۆگ خوازان چەندجوان وتویانە،فەرمانڕەوایەك بەپێی ماف خودایی فەرمانڕەوایی دەکات ئەو لەگەڵ خۆیدا لە لایەن خوداوە پێگەیەکی هەیە وتا مرۆڤ ناتوانێت ئەو مافە بەو ببەخشێت ئەو کەسەی دەبێ فەرمانڕەوای من بێت ئەو کەسە دەبێت وێستگەی لەسەرووی ویستی منەوە بێت ئاسمان ئەو کەسەی بۆ ویستی من هەڵبژاردوە،ئازادی شتێك نییە جگەلە گوێڕایەڵی کردنی ئەم هەڵبژێراوانەی ئاسمان،ئەو ڕادەیەی کە دەتوانین بۆ ئازادی وێنای بکەین هەر ئەمەیە.. کەچی گۆبینۆ بە شێوازێکی جیاوازتر مافی قارەمانپەرەستی لە ڕێگەی ڕەگەز پەرەستیەوە نەخشاندوە وەزیفەیەکی دیکەی پێ بەخشی . بۆ تێگەیشتن لە قارەمان پەرەستی و ڕەگەزپەرستی دەبێ لە ڕوی تیۆریەوە ئەم دوو کەسە لەیەك جیا کەینەوە.

له نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەدا،نوێنەری بنەڕەتی ئەم دوو مەیلە فکریە جیاوازی نێوان گۆبینۆ و کارلایل لەبارەی ڕەگەزپەرەستی و قارەمانپەرەستی ئەمەیە:_بەرهەمەکەی گۆبینۆ نامەیەك دەربارەی نایەکسانی ڕەگەزە مرۆڤایەتیەکان هەروەها وتارەکانی کارلایل دەربارەی قارەمانپەرەستی،ئەم دووانە خاوەنی ئارمانجە گەلی مۆراڵی سیاسی و کۆمەڵایەتی تەواو دوور بون،بەڵام کاتێ قارەمانپەرەستی مانای بنەڕەتی خۆی لەدەست

دەدا وە تێکەڵ بە ڕەگەزپەرەستی بو هەردووکیان بونە بەشی پێکهێنەری یەك بەرنامەی سیاسی،هەنگاوێکی نوێ نرا،هەنگاوێك کە گەورەترین دەرهاوێشتەی لێکەوتەوە.یەکێك لە توکمەترین بیرەباوەڕەکانی گۆبینۆ ئەمە بو،کە ڕەگەزی سپی تاکە نەژادێکە ئەو ویست و توانایەی هەیە دەست بداتە ئافراندنی کەلتور،ئەم پرەنسیپە بەردی بناغەی تیۆرەکەی ئەو دەربارەی جۆراوجۆری بنەمایەی نەژادە مرۆڤایەتێکانە، ڕەگەزی ڕەش وڕەگەزی زەرد.. ژیانی دیکەنین ،وەختێکی بێ تایبەتمەندین کە دەبێ ڕەگەزە بەرزترەکان بیانهێنە جوڵە.

یەکەمین پرینسپی تیۆرەکەی گۆبینۆ ئەمەیە مێژوو تەنیا بەهۆی بەریەککەوتنی لەگەڵ سپیدا پەیدا دەبێت.

گۆبینۆ دەڵێ:لە ئاپۆرەی ئەونەتەوانەی لەسەر زەویدا ژیان ودەژین تەنیادە نەتەوە بەپێگەی پێکهێنانی کۆمەڵگەی تەواو گەیشتون،نەتەوەکانی دیکە کەم تازۆر بەشێوەی سەربەخۆ بەرەو ئەم دە نەتەوە ڕادەکێشرێن،وەکو هەسارەکان کەبەرە وخۆرەکانی خۆیان ڕادەکێشرێن بە دەوریاندا دەخولێنەوە،ئەگەر لەم دە شارستانیەدا تۆخمێك لە ژیان هەبێ کە لە هێزی بزوینەری ڕەگەزە سپیکانەوە دروست نە بوبێت،وەهەر جۆرە تۆونی مەرگ لەواندا هەیە،ئەگەر لە ڕەگەزە نزمەکانەوە دروست نە بوبن کە لە

ڕەگـەزە سـپێکاندا ئاوێتـەبون گـشت ئـەم تیـۆرەی ئـەم کتێبـە ڕێچکەی لەسەر بەستوە ڕاست نابێت.

پرنـسیپی تیۆرەکـەی گۆبینـۆ لێرەدایە،هەرئـەم پرنـسیپەش جیاوازی بەرچاوی قارەمان پەرسـتی وە ڕەگـەز پەرسـتی پێشان دەدات،ئەو دوو تیۆرە لێکدانەوەی تەواوجیاواز وتەنانەت بەرامبەر لەمێژوی مرۆڤدان.

کارلایـل دەپرسـێت:_ئایـاتێکڕای مانـای مێـژوو ژیاننامـەی قارەمانان نییە؟ بەبێ دوودڵـی ولامـی بـەلێ دەداتـەوە. بـەڵام لـە کتێبەکـەی گۆبینـۆدا هـیچ جۆرە بایـەخێك بەکەسایەتیە مێژویـە گەورەکان نەدراوە.

کـاتێ گۆبینـۆ تیۆرەکـەی خـۆی ڕوندەکاتـەوە باسـی تاکـەکان ناکات وتەنانات ڕونکردنەوەی ناوی تاکەکەسەکان ناهێنێـت بـەڵام لەکاتی خوێندنەوەی بەرهەمەکەی کارلایل دەکەوینەژێر کارێگەری ئـــەم بابەتـــەوە، بەدەرکـــەوتنی هەرەگـــەورە پیاوێـــك یـــان بەهەرەمەندێکی ئاینی، فەلـسەفی،یان ئـەدەبی وسیاسـی بەشـێکی نوێ لەمێژوی مرۆڤ دەکرێتەوە.

بۆ نمونە بەدەرکـەوتنی پێغەمبـەری ئیـسلام یـان لەسـەر ئـاین گۆڕانی بەسـەردا دێ _کرامۆل یـان دانـتێ وشکـسپیریش جیهـانی سیاســـەت جیهـــانی شـــیعر دەگۆڕن،هـــەرقارەمانێکی نـــوێ

بەرجەستەبونی هێزی مەزن ونەبینراوی ئایدیای یەزدانییە لەوە سفرکردنەکەی گۆبینۆ،سەبارەت بەجیهانی مێژوو چیتر ئەم ئایدیایە یەزدانییە بونی نییە ونبووە...ئەگەرچی گۆبینۆ وەك کارلایل عارف ورۆمانسیە بەلاّم عرفانەکەی لەجۆری ریالیستیانەترە،گەورە پیاوان لە ئاسمانەوە دانابەزینە سەرزەوی، بەڵکو هێزی ئەوان هەرلەم خاکە واتە لەسەرزەمینی خۆیانەوە سەرچاوەدەگرێت،باشترین تایبەتمەندی گەورە پیاوان تایبەتمەندێکانیش ڕەگەزیانە ناتوانن بە تەنیای کاری ئەنجام بدەن،ئەم پیاوانە تەنیا بەرجەستەبونی،بەرچاوترین هێزەکانی ڕەگەزی خۆیانن، تیۆرەکەی گۆبینۆ دەربارەی ڕەگەز وەك هێزی بنەڕەتی زالّ دەهاتە بەرچاو،بەلاّم میتافیزیکیەکەی ئەوپێ وابوو لەسادەترین جۆری ئەزموون ببەستێت،هەرکەس نەتوانێت دوای زنجیرەیەك درێژ لەهەلّگۆزینە میتافیزیکیەکان بکەوێت .

خوێندنەوەی دیاردەناسی ڕوح لە نوسینی هیگلّ خوێندنەوەی فەلسەفی مێژوی ئەوکاری هەمو کەسێك نییە، بەلاّم هەر کەسێك تێدەگات کەدەربارەی ڕەگەز یان خویندنەکەی بێت.یان لایەنی کەم پێ وادەبێت لێتێدەگات، میتافیزیك هەر لەسەرەتای پەیدابونی خۆیەوە بەدوایی پرنسیپی خۆڕاگردا گۆڕاوە بەلاّم هەمیشە هیواکانی لەم بارەوە بە ناکامی گۆڕاوەن بەبڕوای

گۆبینۆ تائەوکاتەی میتافیزیك مەیلی ئەقلگەرایی نەریتی خۆی نەگۆڕێت ئەم ناکامییە هەردەگۆڕێت ، لەسەرانسەری مێژوی فەلسەفەدا باس وخواسی پرسی بە ناو هەموی،واقعی ئەوانەکراوە،بەلآم هەرگیز ئەوانی فەیلەسوفانی پیٚ نەگەیشتن ئەم ڕاستیە بووکە نابیٚ لەبیری مرۆڤەکاندا بۆ(هەموو واقعێکان بگەڕێن بەلّکو دەبیٚ ئەوانە لەو هێزە جەوهەریانەدا بکەین کەچارەنوسی مرۆڤ دیاری دەکەن، لەهەموو ئەم هێزانە ڕەگەز بەهێزترین وتۆکمەترینیانە ڕەگەز حالّەتێکی واقیعیە نەك وێنەکردنێکی پەتی.

لێرەدا دەمەوەیٚ باس لە ڕەگەزی تۆتالیتار بکەم،کە تیۆەری ڕەگەزی تۆتالیتار چیە؟؟

ئەم بابەتە پێشهاتێکی زانراوبوو، کە ڕەگەز فاکتەرێکی گرنگە لە مێژوی مرۆڤ ،وڕەگەزە جۆراوجۆرەکان کەلتوری گەلیٚ جۆراوجۆریان بونیاتناوە وەئەم کولتورانە لەگەلیٚ ڕوەوە لەسەر یەك نین ، هەروەها لەڕوی جەوهەرەوە بەهاو جیاوازیەکی لەگەلّ یەکدیدا هەیە...تەنانەت مۆنتسکیۆ لە ڕوحی یاساکاندا بەوردی هەلّومەرج جوگرافێکان(فیزیکی) ئەم جیاوازیانەی تاوتویٚ کردبوو بەلآم ئەم پرسە زانراوانە ئەم بابەتە نەبوو گۆبینۆ تاوتو دەکرد.

ئەوكارەی ئەولە ئەستۆی كردبوو گەلی گشتی ترودڙوارتر بوو ، ئەودەبوایە بیسەلمێنێت ڕەگەز وتاكەخوداو فەرمانڕەوایی جیهانی مێژوە وەهێزەكانی دیكە ملكەچ وفەرمانبەری ئەون، بەلام وێنەكردنی نویێ ئێمە لە دەولەتی تۆتالیتار بۆگۆبینۆیە تەواوی نەزانراوبوو ، ئەگەر ئەو بەوە ئاشنادە بوو ئەوا بەتوندی نارەزامەندنی خۆی بۆ دەردەبڕی ، بە بۆچونی ئەو تەنانەت نیشتمانپەرستی بەریتی بوو لە بتپەرستی وقەزاوەتی كوێرانە،ئەگەرچی ئەو لە گەلیێ ئارمانجە نەتەوەپەرستەكان ناكۆك بوو،بەلام لەزومرەی ئەو گروپە لە نوسەران بوو.. كەڕاستەوخۆ لەئامادەكردنی ئایدۆلۆژی دەولەتی تۆتالیتاردا هەمواركرد.

تیۆرەكەی گۆبینۆ هەولدەدات بەهاكانی دیكە وێران بكات خودایی ڕەگەز ئەوجۆرەی دەلێت خودایەكە تیرەی دەكات،رێگە نادات لەپالیدا خودایانی دیكە بپەرستن،ڕەگەز هەموشتێكە وهێزەكانی دیكە هیچ نین،وەمانا یان بەهایەكی سەربەخۆیان نیە،ئەگەرهاتوو ئەم هێزانە توانەیەكیان هەبێت،ئەم توانایە لەخۆیاندا نیە،بەلكو ڕەگەز كە توانای ڕەهایە وسەروەر وفەرمانڕەوایانی ئەوانە،ئەوتوانایەی كە بەوان بەخشیوە گۆبینۆ تەنانەت ئامادە نەبوو،ئەوەپەسەندبكات كەڕەشپێستان یان زەردپێستان لەگەلێ ڕەگەزە سپێكاندا،بەیەك بنەمالەی مرۆڤایەتی

بن ،چونکە ئەوپێی وابوو ئەوەی لەدوی ڕەگەزی ناووبراودەیبینین بریتیە لەدژەندەی بە ناشرینترین وێنە وخۆپەرستی بە بوێرانەترین شێوە،ئایا دەتوانین ئەوە پەسەند بکەین ئەم بونەوارانە لەهەمان سەرچاوەی سپی پێستانەوە هەلقولاون؟چۆن دەتوانین بەوەبڕوامان هەبێ ڕەشپێستان کە لەهەندێ ڕووەوە گەلێ لەجانەوەران نزمترن سەربە هەمان جۆرن کە ئەندامانی خێزانی ئاری نیمچە خودایانەن؟.

لە جیگایەکی تر دەلێ:_شکۆداری ڕێزی کەسی خۆمان تەنیا بەخەرجکردنی پێگەی بەرزتر بەدەست هێناوە ، واتە بەخەرجکردنی ڕەگەز بەدەستمان هێناوە کەفەرمانڕەوایی ڕاستەقینەیە.

ئەو سپی پێستانە کە نازناوی ئاریان بەخۆیان داوە،بەباشی لەشکۆداری مەزنی مانای ئەوە..تێدەگەیشتن بە توندی لەم نازناوە لکاون.

گۆبینۆ لەوەسفی خۆی بۆ ڕەگەز پەرستی دەلێت:_وادێتە بەرچاو کەجانەوەرە دڕەندەکان لەهەویرێکی یەکجار بەرز دروستکرابن وەناتوانرێ وەکو تیۆرەرێك بۆ هەلسەنگاندنی ئەم فیلە قیزەونانە بەکاربرێن،بۆ دەستەبەرکردنی وێنایەك لەدۆخی

جەستەیان دەتوانین پشت بە مەیمونەکان ببەستین وە لەڕوی مۆرالیەوە ناچارین ئەوانە بشوبهێنن،بە ڕۆح گەلی تاریك.

تەنانەت بیروڕاکانی لە ڕوی ئاینیەوە گۆبینۆ پی وایە.ئاینی بوزای نەك تەنیا هەڵەیەکی مۆراڵ بەڵکو هەڵەیەکی مەزنی ئەقڵیشە،بوزیزم نەك تەنیا وێرانی لەهەست کردن،بەڵکو وێرانی لەدەسەلاتی قەزاوەتیشدایە .

گۆبینۆ نەنەتەوە پەرست بوو..نە نیشتمانپەرستێکی فەرەنسی،ئەوتێزی (بۆلن ویی)پەسەندو زیندووکردبوەوە،بەپێ ئەم تێزە هەرگیز فەرنسا یەکێتی نەتەوەی ڕاستیی نەبوە،هەروەها وەکو پێشتر بینیمان فەرنسا دەکرێت بە دووبەشی داگیرکەران وداگیرکراوان،واتە نەجیبزادەکان وەخەڵکی ڕەشۆکی ، کەئەم دوانە لەسەریەك،ئاست نین گۆبینۆ ئەم بۆچونەی بۆ هەمو مێژوی مرۆڤ دەگشتێنێت، وەئەوەی بە نەوە ناوی دەبەین هەرگیز کۆیەکی یەکانگیر نیە،بەڵکو بەرهەمی تێکەڵەبونی خوێنی ڕەگەزگەلی جۆراوجۆرە وترسناکترین شت بەم جیهانەدا هەرئەم تێکەڵبونە خوێنییە .

گۆبینۆ دەلێت:_نیشتمان قسە ناکات وهەروەها ناتوانێت بەدەنگی زولاڵ فەرمان بدات، ئەزمونی هەموسەدەکان بۆمان دەردەخات،هیچ حکومەتێك ستەمکارتر لەو حکومەتە نیە کە

لەسەربنەمایی ئەفسانەکان زۆرەملێ دەکات ، ئەم جۆرە حکومەتە ستەمکارانە بەهۆی جەوهەری خۆیانەوە بێ هەستی وبێ بەزەیین وە لافلێدانیان کەکەس پەسەندی ناکات،لێوانلێوە لەخۆپەرستی.

بە بوچونی گۆبینۆ یەکێك لە گەورەترین سیستمی فیودالی ئەمە بوو کە تیایدا پیاوان لە بەرامبەر وەها بتکەلێکدا سەردا دەنەوێنن..لەم ڕووەوە بەراوردکردنی گۆبینۆ لەگەڵ کارلایلدا گەلێ شتمان فێر دەکات..لە یەکەم نیگادا مەیلی سیاسی ئەم دووانە خزمایەتیەکی نزیك بۆیەك نیشان دەدەن،هەردووکیان دوژمنی سەرسەختی ئارمانجە سیاسیکانی سەدەی هەژدەیەمن واتا ئارمانجەکانی ئازادی یەکسانی برایەتی کارلایل دەرباس بونی نەدەبینی،مەگەر گەڕانەوە بۆ قارەمانپەرەستی نەبێت؟دەیگوت:_قارەمانپەرەرستی تەنیا شتێکە دەتوانێ ئێمە لە کاولبون ووێرانی بشێوی تەواو ڕزگار بکات،بەلام ناکۆکی بنەڕەتی لەنێوان قارەمانپەرەستی کارلایل ڕەگەزپەرەستی گۆبینۆدا هەیە ئارمانجی قارەمانپەرەستی هەوڵدەدات تاوەکو پەیوەندی بکات و یەکبخات بەلام ئارمانجی ڕەگەزپەرەستی دەیەوێت دووبەرەکی دروست بکات و جیای بکاتەوە. بەڕواڵەت تیۆرەکەی گۆبینۆ تێکڕای بازنەی شارستانی تەی کردبو بە

ئامـانجی خـۆی گەیـشتبو،ئەم ئاینـە نوێیـە واتـا ڕەگەزپەرەسـتی قاچی لەسەر پێ سەقامگیر کردبو،چیتر ترسـی لـە هـیچ دوژمنێك نـەبو چـونکە گۆبینـۆ گوتبـوی:_ئـاینی مەسـیحی بێکاریگـەری و بێتوانایــــە،ئاینی بــوزایی گەنــــدەڵی مورالّیــــە و نیــــشتمان پەرەســتی(عــەفریتی کەنعانیــە)یاســا و دادوەری ئەبــستراکتی پەتین،هونەرو جادوگەر و لەشفرۆشە هاوسۆزی بۆ ستەم لێکـراوان و خــەمخواردن بـۆ بـێ دەرامــەتان وەهمـی سەرچـاوەگرتوو لـە هەستیارییەوە.

چــاودێران و ڕەخنــەگران وایــی بـۆ دەچــن کــە حکومــەتی تاکڕەهەنـدی ڕۆژهــەلاتی بــە لێـبڕاوی گـشتیگر وســەرکورتکەرتر لەحکومەتە هاوچەشنەکانی خۆیان لـە ڕۆژئـاوادا بـون، لەڕوانگـەی ئەوانــەوە دیکتاتۆریــەتی ڕۆژهــەلاتی بــێ بــەزەیترین شــێوەی دەسەلاتی تۆلیتار دەنوێنێ.

تێگەیشتنی کلاسیکیانە لـە کارەکتـەری قارەمـان، تێگەیـشتنە لەهــەمان کاتــدا پابەنــدی هــیچ مــەرجێك نییە،کــە قارەمــان دیــسپلینوکۆت دەکات،ســنورە ئایۆلۆژێکــانی لـــە بەردەمــدا قوتدەکاتەوە ئۆرگانیزەی ڕەفتارەکانی دەکات، پابەنـدی بەرنامـە وپرۆکرامە سیاسیەکان نیە، خـۆی نابەسـتێ بەوپـەیمان ووادانـەی لەسەرکاغەز نوسراون، وە بەرنامەی گونجاو بۆهەڵسووکەوتەکانی

لەکایـــەیی سیاســـەتدا دادەنێن،بـــەم تێگەیـــشتنەشەوە ڕەنگـــە بەدەگمەن بتوانن لەبزوتنەوەی رزگاریخوازی ئەم سەدەیەی کوردا باسی دەرکەوتنی قارەمـان بەشـێوە کلاسـیکێکەی بکەین،چـونکە ئـەم بزوتنەوەیـە لەوکاتـەدا کـە نییـەتی سـەندنەوەی مافـەکانی ئێمەیە لەئەوانی تر.

لەهەمان کاتیشدا دیسپلینکردنی ڕەفتارەکانی قارەمانە بە پـیّ بەرنامەیـەك کـە چـۆنیەتی هەڵـسوکەوتەکانی بـۆ بەدەسـتهێنانی ئەومافانـــە ئۆرگـــانیزە دەکات،لێرەشـــەوە قارەمـــان هەرچـــەندە لەسەندنەوەی ماناکاندا لێهاتوو بێـت وەدژی وابەسـتەی وگـیرۆدە بونێك وسوربیّ لەسەر داخوازیەکانی ئەوە جۆرێك لە ئەندامبون لە نـاو ڕێکخراوێکدا قبولـدەکات بـەوەی ئـەو ڕێکخـراوە ئۆرگـانیزەی هەڵـــــسوکەوتی دەکـــــاو شـــــێوەیەکی (دانپیـــــانراوە وپەســـــەندکراوی)ڕەفتـــــاری قارەمانانـــــە ســـــەرکردانەی بۆدەستنیـشاندەکات ،ئـەوە دۆخێکـی کۆیلەبوونیـشی لەئاسـتی ئەوبەرنامەیـــەدا قبولکردوە،چـــونکە پـــەیرەوکردنی بەرنامەکـــە لەهـــەمان کاتـــدا مـــەرجی ڕەوایەتیـــدا بـــە خـــودی بزوتنەوەکـــە وئەندامێتی قارەمان تیایدا .

بەڵام قارەمانی کلاسیك پیاوێـك نییـە لەسـەر بەرنامـە بـڕاوت، مرۆڤێـك نییـە وادەی جیبـەجیکردنی بەنـدەکانی بەرنامەیـەکمان

بـداتیٚ تاخۆیـان وەکـو بەدیهیٚنـەری پلانـەکان بەدەسـتیٚهیٚنەری خواسـتە ئۆرگانیزەکراوەکـان پیٚبناسـیٚنیٚ...ئامـانجی ئـەو لـە بەرنامەیەتـدا دەستنیـشاننەکراوە تالەحالەتـە جیاوازەکانـدا لەژیٚرفـشاری ئـەم یـان ئەوفاکتـەرەدا مـساوەمەی لەسـەر بکـات، یاخود بەهەر نرخیٚك بوە سوربیٚت لەسەر بەئەنجام گەیاندنی ئـەو، پـیٚش هەموشـتیٚك مرۆڤیٚکـی سـاکارە بەهـەمو ئەوهەسـتیاریەوە کەمرۆڤە سـاکارەکان هەیانـە وبەهۆیانـەوە هەڵویٚـستی خۆیـان لـە بارودۆخـەکان وەردەگـرن، لیٚرەوەیـە کەقارەمانـە کلاسـیکیٚکانو ڕەسمیٚکان باکیـان نییـە لـەوەی کۆبونـەوە ڕسمیٚکـان جـیٚ بهـیٚلن لەئاسـت مەرجـەکانی دوژمنـدا هەڵبـچن تورەبن،بـەلاٚم خۆیـان ناخونـەوە شـەرم ناکـەن ودان بـەخۆیان نـاگرن تاکوسـیمایەکی شارستانی تر لەخۆیان پشان بدەن لەبەردەمی رۆژنامە نوسەکاندا بەهـەمان جدیـەت وسـوربون هەڵکەفانـەوە دەدویٚـن.کەسروشـت خۆیانە نـەك خۆبەکـەم زان و رۆمانـسیانە و دەمبەخەنـدە، ئەگـەر قارەمانی کلاسیکی لەسەر بەرنامەو برۆشیتایە ئەگەر ئەوە گرنگی پرۆگرامـەکانی بخـستایەتە پـیٚش گرنگـی مەسـەلەیەکەوە ئـەوە دەبـوو چارەنوسـیٚکی دیکـەش هـەبیٚت لەچارەنوسـەی کەمیٚـژوو تالّیی بەسەرهاتەکانیمان بۆدەگریٚتەوە.

کارەکتـــەری کلاســـیکیانەی قارەمـــان پێکهاتەیـــەکی سـەیرە،تێکەڵەیەکە لـە عەقڵانیـەت وناعەقڵانییەت،لـە ئەفـسانە وواقیع لەهەیبەتێکی کۆمەڵایەتی لەقودسیەتێکی ئاینی لەساکاری ولەشێلیگری هەم بەسام وترسە هـەم ئـارام ودۆسـتانەیە لـە یـەك ساتدا دورەدەست وبێگانەیە، لە هەمان کاتدا نزیك وئاشـنا کەئـەم خەسـڵەتانەش وادەکـات بەئاسـانی نـەکرێت بەچـەمکە باوەکـانی سیاســـەت وبـــە پـــێ میتۆدەکـــانی پراکتیزەکردنـــی سیاســـەت هەڵـــسوکەوتەکانیان هەڵـــسەنگێن وحوکمیـــان بەســـەرابدەین. قارەمـانی کلاسـیکی دەشـێت لـە هەڵـسوکەوتیا کۆنەپەرەسـت وخـوراف وتەقلیـدی کـە لـەڕەق وخـۆ پیرۆزبێتـە پـێش چـاو بـەڵام لەجدیەتدا بۆ داخوازی ومافەکانی مرۆڤێکـی ڕادیکاڵـە کـە زۆرجـار ئەم ڕادیکالیەتە ملی دەکات بەپەتی سێدارەشدا(لاشەی قوربانی)

بیرکردنـەوە لەسـزا وئازارەکـانی قوربـانی لـەپێش مردنیـدا وکردنیـان بەبەڵگـە بۆدەستنیـشانکردنی وردی پلـەی تاوانبـاری جەلاد وهەمیشە یارمەتیمان دەدات لەدەستنیشانکردنی تەواوی .

ئەوبازنـەی کـە قوربـانی لەیەکـەم سـاتی دیلبونیـەوە تـادواین سـاتەکانی ئیـشکردنی هۆشمەنـدی لـەپێش مەرگـدا بەدەسـتی جـەلادەوە دەیـچێژێت هەربۆیەشـە زۆرگرنگـە بـەوردی گـوێ لەبەسەرهاتی یەکبەیەکی ئەودیلانە بگرین،کە بـەناو ڕێگەوتەکانـدا

دێنــەوە ناومــان وباســی ئازارەکانیمــان بۆدەکــەن واتــە باســی ئەوبەشــەی ســزامان بۆدەکــەن کەلــەپێش مەرگــدا ڕۆتینێکــە لەڕۆتینــەکانی پەیوەنــدی جــەلاد بــە قوربانیــەوە، ئەگــەر دیلــە ڕزگاربوەکــانیش نەگەڕێتــەوە ریوایــەتی ژیــانی خۆیمــان بۆنەکــەن ئــەوە ئێمــە هــەرگیز شــارەزای نــابین چــونکە زۆربــەی کــات هــاودەردەی ئێمــە لەگــەڵ قوربانیــدا وڕقــی ئیمــە لەجــەلاد لــە ساتەوەختی پاش مردنی قوربانیەوە دەستپێدەکات، وە ئەمــەش وادەکــات ئێمــە بەشــێکی زۆری ئەوســزایانەمان لــەبیر بــچێت کــە قوربانی تاساتی مــەرگ بەدەســتی جــەلادەوە چەشــتونی پێموایــە هەرئەمــەش وادەکــات کــە ژمــارەی قوربانێکــان لۆلیزەی شــوێنی ڕوداوەکــان لەســاتی قوربانیبونیانــەوە هێنــدە لەلێکۆلینەوەکانــدا گرنگــی بەخۆیــەوە بگرێــت نــەك لــەپێش ئەوساتەشــەوە کەســزا شاراوەکان تیایدا باڵادەستن، ئەم لە یادکردنــەش نــەك هــەر تــەنیا پلەی تاوانباری جەلاد کەمدەکاتەوە وەچاوی لێ دەپۆشێت بەڵکو لەئاست گیڕانەوەی ئیعتبار بۆگەورەیی ئینسانیەتی پێشێلکراوی قوربانیشدا سیستماتیك دەکات کــە بابــەتێکی گرنگــی فەلــسەفەی ئەخلاقە.

زانایــانی زانــستە سیاســێکان وەك مۆنتــسکیۆ بەرلــە هەرشــت هــۆکری ئەوکارێگەریــە پــڕ ئازارانــە کەلەســەر ڕۆی ڕۆژهــەلاتی

دەیخستە ئەستۆی تاك وخاوەنێتی وتوێژەرانی زانستی ئابوری حەزیان لە توێژینەوەی پانتای بەرێوەبەرایەتی وخاوەنێتی ئەوجۆرە حکومەتانە بون بەتایبەتی ئابۆریزانانی کلاسیك کەوتنە ژێرکاریگەری ئەوهەولّە بەربلاّوانەی کەحکومەتی رۆژهەلاّتی بۆ رایەڵی ئاودێری وکشتوکاڵی بۆدامەزراندنی پەیوەندی دەیدات...سەر ئەنجام ئەوان واتێگەیشتون کە لەرۆژهەلاّتدا حکومەت گەورەترین خاوەنی زەوییە.

بەلاّم چەمکی سەرە رۆ لەسەردەمی فەیلەسوفانی یۆنانی کۆندا بۆ وەسفکردنی حکومەتە ئاساییەکان بەکار دەبرا بۆنمونە ئەرستۆ لەکتێبەکەیدا (سیاسەت) دەنوسێ:_رەوشتی بەربەرەکان حەزی لەکۆیلەیەتیە تارەوشتی یۆنانێکان، رەوشتی ئاسیایەکانیش پتر هۆگری کۆیلەتیە تارەوشتی ئەوروپێکان،هەربۆیە ئاسیایەکانیش حکومەتی سەرەرۆی وبە بێ نارەزایەتی دەربرین پەسەند دەکەن.دیارە ئەم رایەی ئەرستۆ تێزێکی چەوتە چونکە مێژووی ئەورووپاش یەکیکە لەو مێژووە درندانەو بەربەریانە کە بەخوێنی ملیۆنان مرۆڤ سورکراوە.

مۆنتسکیۆ لەروحی یاساکاندا بۆیەکەمینجار تیۆرەیەکی بەراوردکاری لەبارەی ئەوشتەئارەستە دەکات،کە بەسەر رۆی ناودەنێ وەك شێوەیەك لەحکومەتی نا ئەورووپی دەنیاسێنێ کە

لەبەرانبەر فیودالّیزم ئەوروپیدا ڕادەوەستێ لە ڕوحی یاساکان کتێبی هەڤدەیەم دەنوسێ:

ئاسیا ئەو ئیمپراتۆریەتەی حەزی لەئەوروپادا دەرەتانی پەیدابونی ئەوئیمپراتوریەتانە نەبوە...هەر بۆیە لە ئاسیادا دەسەلاتی سیاسی بەردەوام سەرەڕۆیانەبێت..چونکە ئەگەر کۆتی کۆیلەیەتی بەهێز نەبێت،ئیمپراتۆری پارچەپارچە دەبێ وئەمەش لەگەلّ سروشت وجوگرافیای ئاسیایی نایەتەوە بەپێچەوانەوە دابەشکردنی جوگرافیاکانی ئەوروپا بونەتە هۆی ولاتانی ئەم بەشە لەسەرزەوی پانتاییەکی مامناوەندیان هەبێ هەر بۆیە حکومەتی پشت ئەستور بە یاساکان نەتەنیا لەگەلّ بەردەوامی مانەوەی ولاتانی ئەوروپی ناتەبا نییە بەلّکو لەگەلّ مەزاجیان ڕێکدەکەوێ کە بەبێ یاسا ئەم دەولّەتانە بە لێژاوی هەرەسدا شۆڕدەبنەوە دەبنە پاروی دراوسێکانی خۆیان ،ئەم تایبەتمەندیە بوەتە مایەی مەیلی ئازادی هەربۆیە ملکەچ بونی هەرشتێك لە خاکی ئەوروپا بۆ ولاتێکی بیانی زۆر ئەستەمە،تەنیا یاساو بەرژەوەندیە ئابوریکان دەتوانن لە ئەوروپا ملکەچی ولاتیکی دیکە بکەن،بەپێچەوانەوە لەئاسیادا ڕوحی کۆیلەیەتی وبەندەیی زالّە، نەتەوەکانی ئاسیا هیچ کات نەیانتوانیوە کۆتی کۆیلەیەتی لە ئەستۆ داڕنن،لەمێژوی ئەواندا شتێك بێجگە لە

بەندەیی وکۆیلەیەتی نیە.بەڕای من ئەم تۆمەتبار کردنە ناراستە چونکە ناتوانین مەیلی ئازادی خوازانەی ڕۆژهەلات بسڕینەوە.

لێرەدا بابزانین بۆچی رژیمی ڕۆژهەلاتیانە هەمیشە لەم پەیرەوە سەرکەوتوبوە...ئاخۆ بەشێکی ئەم پروسەیە دەرئەنجامی قبولکردنی کۆیلەیتی نیە...ئەی خۆ بەکۆیلەکردن چیە؟ بەشێوەیەکی گشتی پێویستمان بە وڵام وناساندنی خۆ بەکۆیلەکردنە لە مێژوی مرۆڤایەتی ڕەگی خۆی هەیە ..من لێرەدا ڕوناکی دەخەمە سەر ڕوحی خۆ بەکۆیلەکردن.

دۆلاپۆتی پێ وایە:یەکێ لەتەیبەتمەندیە سەخیفەکانی چەشنی مرۆڤ ناچار بونە بەملکەچی وەخۆ بەدەستەوەدانە لە بەرامبەر ستەمدا ، دۆلاپوتی دەڵێ:_ئێوە دەتوانن خۆتان لە بەکەم زانی وپیسی رزگاربکەن.ئەمەش بێ ئەوەی هیچ هەنگاوێك هەڵبینن...تەنیائەوەندە بەسە خواستی ئازادیتان هەبێت،هەرکات بریاربدەن چیدی کۆیلە نەبن یەکسەر ئازاد دەبن.

ئەمەش بریارێکی عەقلانیەو بریاردەریش مرۆڤێکی خاوەن خودە،کە لەبەرامبەر خۆ بەکۆیلەکردنی خۆیدا هۆشیاربوەتەوە.

ناوبراو پێ وایە ئەوانەی ئەڤینی بەدەستهێنانەوەی ئازادییان لەسەردایە لەسایەی دەسەڵاتی ستەمکاراندا ناتوانن هیچ کارێگەریەکی لەسەر کومەڵگا دابنێن تەنانەت گەر ژمارەشیان

زۆربێت،ئەوەهیچ پەیوەندیەکیان لەنێواندا نیە وبەیەکتری نامۆن ئەوان لەژێر ستەمی زۆرداردا ئازادی کارکردن تەنانەت ئازادی بیرکردنەوەش لەدەستدەدەن وە لەخەونەکانیاندا بە تەنیا دەمێننەوە.

بەم پێ یە کاری ئازادیخوازان تەنیا بڕیاردانی خێرا نییە هێندەی ئەوەی خۆسەلماندن لەسەر ئاستی کارکردن وقسەکردن وبیرکردنەوە کەستەمکاری زەوتی کردوە.

ستەمکاری گاڵتە کردنە بەخۆدی کۆمەڵایەتی و هەڵگێرانەوەی بۆ ئاپۆرەی زۆربەیەکی بێدەنگ،ئەمە جگەلەوەی ستەمکاری بە تاکرەوی هەموو هاندەرێکە لە تاکەکەسدا بۆئەوەی بیکاتە دەست وپێوەندو کاسەلێسیش مەرایی دەکا ، ومرۆڤێکی دوو ڕووی بێ ئیرادە تاکو نەتوانێ لەدەرەوەی ئەو سنورەی ستەمکاری بۆی دەست نیشان دەکات،بیر لەژیانی مرۆڤانەی خۆی بکاتەوە.

لاپۆتی پێ وایە دەستوپێوەندەکانی زۆردار خۆیان نەفی دەکەن وهەرچی لەدەستیان دێ دەیکەن بۆئەوەی ڕزامەندی زۆرداران بەدەست بهێنن،نەك بۆئەوەی بۆ خۆیان ژیانێکی ئاسایی بژین،ستمکاریش پیویستی بە ئەخلاق نییە چونکە ئەخلاق ئەوگەرانتەیەکە ناهێلێ سیاسەت لە ویژدان ودادپەروەری دابڕێ.

ستەمكاری بەهۆی ئەو دابڕینەی ئەخلاق لە سیاسەت خۆی نمایش دەكات وبەبیانوی بەرەنگاربونەوە لەگەڵ بێ سەروبەریدا،كۆمەڵگا دەكاتە گۆڕەپانی زۆرداری چەوسێنەران...ستەمكاران بەدرێژای مێژوو هەرلەوكاتەوە كە قەڵانشین بون هەتائێستا كە نیشتەجێیی دواین مۆدیلەكانی نەخشەی بیناسازی بەردەوام لەپشت مێژوو ئەوودیوو پەنجەرەی كۆشك ونوسینەكانیانەوە ددان لەخەڵكی جیڕ دەكەنەوە وێنەی تاوانبارو خراپەكاریيان پێ دەبەخشی، ستەمكاری ناتوانێ یەك ڕۆژ لەسەرحوكم بمێنێ ئەگەر بەردەوام وەك تاوان كار ومەترسی هەڕشەیەك بیر خەڵك وگروپ وتاكەكان نەكاتەوە لەبەر خۆی.

كولتوری ستەمكاری ئەوەندە ڕقی لە قسەكەرە ئەوەندەش بێدەنگ ولەرزیوی خۆش ئەوێ.ئەوچاوانەشی خۆش ئەوێ كە ڕویان لەزەویە وبێ نیگان،بەدیتنی نیگاكانیش كە پڕن لە بینین وە تەماشا هەراسان دەبێت...تەقدیسكردن یەكێكە لەومیكانیزمانەی كە دەست وپێوندەكانی ستەمكار پەنای بۆدەبەن تاكو لەو ڕێگەیەوە پێمان بڵێن ستەمكاربونێكی بان مرۆیی وباڵایە.

بەعس تەنیا وەك ئینتمایەكی كاتی لە ژیانی گەلانی عێراق نەمایەوە بە تەنیا بەڵكو بوە كولتورێكیش كە ماوەیەكی زۆری

دەوێ تاتەواوەتی بەهاکانی نرخیان نامێنێ..بۆیە کاتێك بەعس وەکو سیستم نامێنێ، ئەوە لەکۆی ویژدانی خەڵکانێکی زۆردار بەرەنگاری ئەو ئازادیە دەکرێ کە بەعس زەوتی کردبوو.

هیچ سیستمێکی سیاسی هیچ ستەمکارێکی لەدونیادا ناتوانن دڵنیابن لەمانەوەی هەتاهەتای خۆیان،بەڵام ئەوەی دڵنیایی بە ستەمکاران دەبەخشێ ئەو ڕاهاتنەی مرۆڤە ستەملێکراوەکانە لەگەڵ ستەمکاریدا خوو پێوەگرتنی کۆمەڵانی خەڵکە بە ملکەچی و سەردانەواندی خۆبەخشانە وخۆویستانەیە.لاپۆتی پێی وایە:_هەمو دەوڵەتێکی ستەمکار بەپێ ویستی ڕەزامەندی گشت خەڵك دروستبووە وبەندایەتی دەنوێنن وە ئەگەر بەوجۆرە نەدەبوو هیچ جۆرە چەوساندنەوە یاخود لەبنەڕەتدا دەوڵەتێکی ستەمکار هێندە بەردەوام نەدەبوو.

هۆکاری ملکەچی مرۆڤ لەسەردەمی منداڵیدا ئەوەیە کە هێشتا وزەی عەقڵی وهێزی لێکجیاکردنەوە پەرەی نەسەندوە،بۆیە دەبێ ملکەچی دایك وباوکی بێت،بەڵام کاتێ مرۆڤ پێدەگات دەبێ خاوەنی خۆی وعەقڵی خۆی وکاسایەتی خۆی بێت.

دۆلاپۆتی پێ وایە:هیچ دەسەڵاتێك نییە جگە لەودەسەڵاتەی کەئێوە پێتان سپاردوە تاکو لەناوتان ببات،ئەگەر ئێوە بۆخۆتان چاوی پێ نەبەخشن ئەو هەمو چاوانەی لەکوێ بوو تاچاودێریتان

بكات؟ئەگەر خۆتان دەست وبازوی پێ نەبەخشن ئەو لەکوێ ئەوهەمو دەست وبازوە دەستەبەردەكات..تا ئێوە سەركوت بكات؟ئەگەر خودی ئێوە هێزی پێ نەبەخشن ئەو چون دەتوانێ فەرمانڕەوایتان بەسەردا بكات ؟ئەگەر ئێوە هاوكاری لەگەڵدا نەكەن چۆن ئەودەتوانێ بە گژتاندا بچێتەوە؟.

كاتێ مرۆڤ وئاپورەی خەڵكی بریار بدات چیدی كویلەنەبن زووبەزوو ئازاد دەبن تەنیا ئەوەندە بەسە واز لەپشتگیركردن بێنن بۆ ئەوكاتە ئەوپەیكەرە گەورەیە دەلەرزێ وبەسەریەكا دەڕۆخێ.

لاپــۆتی دەڵێــت:_زۆرداران ســێ دەســتەن .دەســتەی یەكەم:خەڵكی هەڵیاندەبژێرن:دەستەی دوهەم:بە یارمەتی سوپا بەزۆری چەك وبەدەسەلات دەگەن گروپی سیهەم :_دەسەلات بەمیرات وەردەگرن .

ناوبراو پێ وایە:_كەنەریت وخوو یەكەمین خۆ بەكۆیلەكردنە.

پروپاگەندە وفێڵە ئایدیۆلۆژیەكان شێوازێكی ترە بۆشێواندنی خەڵك،پاشای ئاشوری و مادەكان بەدەگمەن لە بەرچاوی خەڵكی سادەدا دەردەكەوتن نەوەك خەڵكی عەوام گومان لە جیاوازی نێوان شاو و خەڵكی ئاسایی بكەن،لە بارەی تەخت وتاجەوە رەمزی ئەفسانەیی و جادوی هەڵدەبەستران تاوەكو بەم ڕێگایە ژێردەستەكان هانبدەن بۆ ڕێزلێنان و ستایشكردن،باسكردنی

هـەموو ئـامراز و ئـەو چـەکانەی کـە چەوسـێنەرە کۆنـەکان بـۆ سـەقامگیری و مـومکیکن کردنـی حکومـەتی خۆیـان بـە کاریـان دەهێنا جێگەی غەمبارییە،وێناکردنی ئەو ڕاستیە کە ئـەوان فێـڵ و تەڵەکەیەکیان بەکار دەهێنـا وە داننـانی بـەم خاڵـەدا کـە خـەڵکی عەوام ئاپۆڕەکان تاچ ئەندازەیەك شێتانە و ساکار بوون.

زۆردارانـــی کـــۆن ئـــەوان خۆیـــان بـــە پێگـــەی خوایـــەتیش گەیاندوە..لەم ڕێگەیەشەوە سودی گەورەیان لە ئـایین وەرگرتـوە بۆ ڕامکردنی خەڵك.

ستەمکاران نـەك سـودیان لـە ڕابـردوو وەرگرتـوە نـەك خـەڵکی گوێڕایەڵ نۆکەرئاسا بن بەڵکە لەسەر سوپاسگوزاریش ڕابێنن.

لاپـــۆتی پێوایـــە: یـــەککگرتوان، پارێزگـــاران، تابیعـــەکان، وەفادارەکان، گاردی ئیمپراتۆری،بیرۆکراتەکان بە ڕەوتی بنەمایی ڕازی باڵادەستی شـا و بناغـەی حکومـەتێکی ستەمکار لـە قەڵـەم دەدا.

مۆنتسکیۆ کە بۆچونی(بۆدەن وبیرنیـە)زۆری کـارتێکردبوو پـتر لە هەموو کەسێکی دیکە چەمکی سـەرەڕۆیی ڕۆژهەڵاتیانـە بـەرەو پێدا،لێرەشا باشتر وایە قەڵەم بسپێرین بە لۆی ئالتوسێر.

فەیلەسـوف فەرانـسایی١٩١٨_١٩٨٩تـا ئـەویش بۆچـونەکانی مۆنتسکیۆ بەشێوەیەکی تایبەتی بگێڕێتەوە.

(یەکەمین تایبەتمەندی سەرەڕۆیی ئەمەیە:_کە ڕژیمێکی سیاسی بێ پێکهاتەیە،نەپێکهاتەی سیاسی قەزای هەیە نە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی..مۆنتسکیۆ زۆر جاران دەڵێ:_کە سەرەڕۆیی بێ یاسایە،بێ شەك مەبەستی ئەو بەر لە هەمووشت یاسابنچینەکانە..بەڵام مۆنتسکیۆ ئەمەش دەڵێ:_کە سەرەڕۆی هەموو دەسەڵاتێ دەبەخشێ بە سەروك وەزیران.

کتێبی دووهەم...کتێبی پێنجەم..

ئەم گوێزانەوەی دسەڵات بە ڕواڵەت یاسایی سیاسیە بەڵام لەڕاستیدا یاسای مەیلی دەروونیە(یاسای دەرونزانیە کە خووی درندانەی سەرەڕۆ پیشان دەدات..ئەم یاسایە فێڵاویە کە بە نارەوای مەیلی دەرونی دەکات،بەردەوام دەکرێ تەواوەتی سیاسەت بە هەوا و مەیلی دەرونی بگۆڕێتەوە هێشتا پێکهاتەیەکە لە ئارادا نییە،ئەگەر لە حکومەتی سەرەڕۆدا دین دەوری سەرەکی دەگێرێ و دەبێتە سەرچاوەیەکی لە سەرووی سەرچاوەی سیاسەوە و لە هەندێ بواریشدا دەبێتە مایەی نیشتنەوەی بێبەزەیی سوڵتان و هەمیشە تاڕادەیەك ترسی ژێردەستەکانی کەم دەکاتەوە،سەرەڕای ئەمانەش ناوەڕۆکی ئەمەیان سۆزە،چونکە لە ڕژیمی سەرەڕۆدا دین بۆخۆی سەرەڕۆیە و

ترسێکه لەگەڵ ترسەکانی پێشوو کەڵەکە دەبێ(ڕۆحی یاساکان کتێبی پێنجەم بەشی چوارەم).

سەرەڕۆیی یاسای سیاسی و دادوەری نییە،نە ڕابردوی دێتەوە یاد نە لەبیری داهاتودایە،ڕژیمەکە تەنها لە چرکەساتدا کات ڕادەبوێرێ،ئەم ناسەقامگیریە،بێ پێکهاتەی کۆمەڵایەتی دەیپارێزێ و گەرەنتی دەکات،لە دیمۆکراسی دا دادوەرەکان خاوەن پێرەوی ناوخۆ و ستاتۆن،ماڵ و پلە وپایەیان هەیە وپشتی دەوڵەمەندبوون دەگرێ.لە ئەوروپادا حکومەتە پاشایەتیەکان تایبەتمەندی نەجیبزادە وئاینینەکان بەڕەسمی ناسیوە،بەڵام لە حکومەتی سەرەڕۆدا هیچ تایبەتیەك نییە کە تاکەکان لە یەکدی هەڵاوێرێ سەرەڕۆی یەکانیەکەی بێ لغاو چونکە لەژێر دسەڵاتی سەرەڕۆیانەدا هەموو هاوڵاتیەك لە یەك ئاست و پلەدان کتێبی پێنجەم بەشی چوارەم.

مۆنتسکیۆ لێرەدا دەلێ:لە حکومەتی سەرەڕۆ هەموو کەسەکان یەکسانن بەڵام نەك لەبەر ئەوەی کە کەرامەتی مرۆڤانەیان هەیە، واتا وەك ئەو دۆخەی کە مرۆڤەکان لە دیمۆکراسیدا هەیانە بەڵکو تاکەکان بۆیە لە حکومەتی سەرەڕۆدا یەکسانن چونکە هەموویان بە هیچ و بەسووکی سەیر دەکرێن(کتێبی شەشەم بەشی دووهەم).ئەم یەکسانیە بەهۆی

سەرکوتی هەموو پلە کۆمەلایەتیەکان وەها و ئاستکردنی مەسەلەکانەوە دانراوە.ئەم رژێمە بە زەبر و زەنگە نە رێز لە پێگەی میراتی تاکەکان دەگرێ نە پلەی نەجیبزادەیان لە بەرچاو دەگرێ..سەرەرۆیی هەبوونی خانەدانە رەسەنەکانی بۆ قوت ناچێ و پیاوی دەوڵەمەندیش بەهێز ناگرێ،سەرەرۆ تاقەتی مانەوەی خانەدانەکانی نییە کە لە درێژایی سەردەم و قۆناغەکان ماڵیان کۆکردوتەوە و ناتوانێ سەرکەوتنی ئەوانەش ببینێت کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیان گەشاندوەتەوە..سەرەرۆ ناتوانێ تەنانەت پێگە و مەقامێکیش پەسەند بکات کە بۆخۆی بەسەربەستەکانی بەخشیوە،لە حکومەتی سەرەرۆدا هیچ کس لە گیان و ماڵی خۆی ئەمین نییە،لەوەها رژێمیکدا شتێك لەئارادا نییە کە مرۆڤەکان لەرۆی کۆمەلایەتیەوە لە یەکتر جیا دابنێت یان نیشانەیەکی لە پلە وپێگەی کۆمەلایەتیەکانیان پێوە بێت.. هیچ جۆرە رێکخراوێکی کۆمەلایەتی لە ئارادا نییە کە میراتگرەکان بۆ رێ داهاتوو رێبەری بکات و پایەی کۆمەلایەتیان بپارێزێت هەر وەك چۆن سەرەرۆی بێ پێکهاتەی سیاسی و دادوەریە هەر بەوجۆرەش بێ پێکهاتەی کۆمەلایەتیە.کات لە روانگەی سەرەرۆ خاڵی بەرانبەری ماوەیە واتا تەنیا چرکەساتە..سەرەرۆیی نەتەینا بێ دامەزراوە و پلە و کۆمەلایەتیەکان و ئەو خانەدانانەیە کە لە کاتدا

بەردەوامن،بەڵکو خودی کردارەکانی ڕژیمیش لەیەك چرکەساتدا دەردەکەوێت،سەرەڕۆ لە جیهانی خەیاڵی خۆیدایە ئەو بیَ ئەوەی بیربکاتەوە،بەڵکە هاوڕا دژەکان هەڵدەسەنگێنیَ،بە بیَ ئەوەی بگاتە ناوبژێوانێك لە بڕیارەکانی دا(سنورەکان)ڕەچاو بکات..تەنیا لە چرکەساتدا بڕیار دەدات،چونکە بیرکردنەوە کات دەبا پێویستی بە بیرۆکەیەك بۆ داهاتو هەیە..بەڵام سەرەڕۆ هیچ بیرێکی لەبارەی داهاتووەوە لەو بازگەیە زیاتر نییە،کە قازانجی پیَ دەگات تا ئەمڕۆی خۆی بگەینێتە سبەی...

ڕۆحی کاربەدەستان دەلیَ لە هەمووبوارێکەوە لەو دۆخەدان کە فەرمانڕەواکەیان تێدایە..فەرمانڕەوایەك تەنیا لە ڕێگەی مەرگەوە لە داهاتووی خۆی ئاگادار بێت،ئەویش بەو مەرجەی کە هەرئێستا لەسەرەمەرگدا نەبێت.

ژینی ڕژێمی سەرەڕۆ هەوەس وتۆنیستی چرکەساتانەیە،ترس نە سۆزێکی لێکدراوە،نە سۆزێکی مەعریفیە،ترس...نە یاسا دەناسێت نەڕیسا، نەسۆزێکی پێشینەی هەیە نە نازناو،ترس سۆزێکی سانایە کە بەردەوام خۆی چەندپایە دەکاتەوە،لەنێوان سۆزە سیاسیەکاندا،ترس تەنیا سۆزێکە کە سیاسی نییە..بەڵکو دەروونیە،چونکە سۆزێکی نەڕاستەوخۆ و چرکە ئاسایە،بەم

وەسفکردنە،ترس سۆزێکە بنەمای ژیـنی ڕژێمێکـی سەیروسـەمەرە و سەرەڕۆ پێکدێنێ.

ڕەنگـە گـرنگترین تایبەتمەنـدی وەرچـەرخانی بـیری سیاسـی مۆدێرن،سەرهەڵدانی توانایەکی نوێ،واتا هێـزی بـیری ئەفـسانەیی بێت،لەزهنیـەتی ڕژێمـە سیاسـیە مۆدێرنەکانـدا باڵادەسـتی بـیری ئەفسانەیی بەسەری ئەقڵانیدا ئاشکرایە.

واش دێتـە پـێش چـاو بـیری ئەفـسانەیی دوای ململانیەیـەکی توندوکورت سەرکەوتنی بنجبڕ و ئاشکرای بەسـەر بـیری ئەقڵانیـدا بەدەسـت هێنابێـت، بـەڵام چـون ئـەم سـەرکەوتنە بەدەسـت هات؟چۆن دەتوانرێت ئەم دیاردە نوێیە کە وەها کتوپڕ لە ئاسۆی سیاســی ئێمـــەدا ســـەری هەڵدا،ڕوونکردنـــەوە ئـــەنجام بدرێت؟دیاردەیـــەك کـــەوا دێتـــە بەرچـــاو،بەواتایەك هـــەمو وێناکردنـــەکانی ئێمـــە ســـەبارەت لـــە ڕاڤەکارییـــەکانی تایلۆر،فرەزێر،ماکسی مۆلـەرو،هێربرێت سبنـسەرو،هەمویان بـەم گریمانـەوە دەسـت پێدەکـەن، کـە ئەفـسانە یەکـەم و بەرلـە هەموشتێك،کۆلێك لە وێناکردنەکان و دەرخـستەکان و بیروبـاوەڕە تیۆریـەکان بڕیارەکانـە،وە لەبـەر ئـەوەی ئـەم بیروباوەڕانـە لـە نـاکۆکی ئاشـکرادان لەگـەڵ ئـەزمونی هەسـتی ئێمـەدا،وە لەبـەر ئەوەی شتە مادێکان کە لێکچوی ئەم دەرخستنە ئەفسانییانە بـن

بونیـــان نییـــه كەواتـــه بـــەم دەرئەنجامانـــه دەگەن،كـــه ئەفـــسانه وەهمێكی پەتیە،ئەم پرسیارە وەكو پێویست ئاراسته دەكرێت كه بۆچی خەڵكی بەم هەموو كەلەڕەقیە وە سووربونیان لەسەر ئـەم وەهمە پابەند دەمێنێتەوە وە پێیان باشـترە لـه جیهـانێكی پڕلـه لێكدانەوەی چەوت و وەهم و خەونەكاندا بەسەر بەرن.

ئەمـــەش جۆرێكـــه لـــه ئەفـــسانەی مرۆڤەكان،تێكـــدانی ئـــەم چـــەمكانەش پەیوەندیـــەكی ڕاســـتەوخۆی بـــە ژیـــان و بـــاری مرۆڤەكانـــەوە هەیە،هـــەروەها پەیوەندیـــەكی ڕاســـتەوخۆی و كاریگـــەری لەســـەر تراژیـــدیای كـــورد هەیـــە بەتایبـــەتی ئـــەنفال وهەڵەبجە كە دوو ڕوداوی گەورەی مەرگەساتی گەلی كوردە.

كاتیَ كە باس لە ئەفسانە دەكەین واتە ڕۆڵی لە ژیانی كولتوری مرۆڤدا چیە؟هەركە ئـەم پرسـیارانە بخەینـەڕوو لـە شـەڕی نێـوان بۆچـونە بەرامبەرەكانـدا،خۆمان بـە تێـوەگلاو دەبینینـەوە لـەو بارەیەوە لایەنی شەكەتە،نەبونی ئـەزمونێكان نییە،بـەڵكو زۆریـان لـە چـەند گۆشـەیەكی جۆراوجـۆرەوە بـیری ئەفسانەیان تـاوتویَ كـردەوە.گـەلیَ لـــه مـــرۆڤ ناســـان گوتویانـــه..وێـــڕای شـــێوە جۆراوجۆرەكـانی دیاردەیـەكی یـەكجار سـادەیە،كە بـەهۆی بـونی پێویـست بـە ڕوونكردنـەوەی دەروونناســی،یان فەلــسەفەی دژوار ناكات،ئەفسانە هەر ئەوساویلكەیەیە،چونكە ئەفسانە شـتێك نییـە

جگە لە پیرۆزکردنی ساویلکەی نەژادی مرۆڤ،ئەفسانە بەرهەمی تێڕامان یان بیرکردنەوە نییە،وە ناتوانرێت ئەوە بەتەواوی بە بەرهەمی خەیاڵ دابنرێ،خەیاڵی پەتی ناتوانێ هۆکاری هەمو ناکۆکێکان و توخمە سەیروسەمەرەکان و خەیاڵی ئەفسانە بێت،بەڵکو زیاتر نەفامی سەرەتایی مرۆڤە کە هۆی ئەم قسەی پوچ وپڕ لە ناکۆکیەکانە بە بێ ئەم نەفامیە سەرەتاییە ئەفسانەیش پەیدا نەدەبوو، لەڕوی مێژوییەوە هیچ کولتورێکی گەورە نادۆزینەوە لەژێر کۆنترۆڵی ئەفسانە و لەژێر کاریگەری توخمە ئەفسانەیەکەدا نەبوبێت.

ئەوەی لەنێوان ڕاڤەکردنی مرۆڤی کێوی لە جیهان و بۆچونە بەدەست هاتوەکانی ئێمە لە جیهاندا جیاوازیەکی گەورە دروست دەکات یان وێنەکانی بیر،واتە بنەمای بەڵگە هێنانەوە ئاقڵ بوون نین،بەڵکو ناوەڕۆکە،واتا شتە دراوەکان و ئەو زانیاریانەیە،کە بنەماکانی بەڵگە هێنانەوە وئاقڵ بون لەو ناوانەدا پیادە دەکەین.

بەپێ بۆچونی تایلۆر:یەکەم پێویست بۆ تاوتوێ کردنی ڕێك وپێکی نەژادە خوارترەکان بریتیە لە خستنە ڕوی پێناسەیەکی دەستپێك لە ئاین،ناتوانین لەم پێناسە کردنەدا بڕوابون بە خودای مەزن داوەری دوای مەرگ..بڕوابون بەو دونیاوە بتپەرەستی یان ئەنجامدانی قوربانیەکان تێهەڵکێش بکەین،چونکە تاوتوێکردنی

وردتری دەستکەوتەکانی نەتەوەناسی،وامان لێ دەکات بڵێین وەها لاێنگەلی بۆپەیدا بونی ئاین مەرجی پێویست نین،ئەوانە تەنیا ڕویەکی تایبەت لە ژیانی ئاینی دەخەنە ڕو نەك لانی گشت و هەمو جیهانەکەی.

تایلۆر دەنوسێ: چ شتێك دەبێتە هۆی ئەوەی لەنێوان جەستەی زیندو جەستەی مردودا جیاوازی دروست بێت؟هۆکارەکانی نەخەوتن،نەخەوتن ڕاکێشان نەخۆشی مەرگ چین؟دووهەم،ئەو شێوە مرۆڤایەتیانە کامانەن کە لە خەونەکان درەختەکاندا دەردەکەون؟.

لە تەوەرێکی تری ئەم باسە دەگەڕینەوە سەر بۆچونەکانی فۆکۆ سەبارت بە کۆمەڵگا تەقلیدی و پیشە سازێکان ئەمەش بۆخۆی دەسەڵاتی سزامان بۆ ڕون دەکاتەوە.

جیاوازی نێوان کۆمەڵگا سەرەتایی و مۆدێرنەکان لە کوێدان،جەستەی سەرۆك چیە؟کاریزمە چیە؟هەمو ئەمانە وامان لێ دەکات بۆچی ئەنفال لە بێدەنگیەکی کوشنەدەدا روی داوە؟بۆچی بەشێکی فراوانی کۆمەڵگای کوردی خۆی تیایدا بەوپەڕی بێ باکی و شانازی و سەرکەوتنەوە بەژداری لەو قەسابخانە کردوە بێ ئەوەی هەست بە کوشتنی نەتەوەکەی بکات؟ئاخۆ ئەم کوشتارە گەورەیە بڕیاردانی خودی کۆمەڵگای

کوردی وهەڵبژاردنی خودی ئەو قەسابخانەیە نیە؟ئاخۆ ئەمە بەڵگەی ئەوە نییە کە تاکی کوردی هیچ ئینتمایەکی بۆ نەتەوەی خۆی نییە؟چی وادەکات ئەم هەلومەرجە لە کۆمەڵگاکان بەجۆرێکی ئەفسانەیی بەرقەرار بێ،لەباری تیۆری ئەم ڕوداو وناونیشانە چۆن دەخوێنرێتەوە؟ئیشکالیەتەکان لە کوێدایە؟.

شمولیەتی ئەم کارەساتە بێ بەزەییانە لەکوێدایە؟ئەمەو چەندان پرسیاری دی وای لێ کردم دەست بەم بە شێوە لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنە بۆ کەشف وناسینی ئەنفالی ڕۆژهەڵات..وە ئەنفالکردنی کوردبکەم.

لێرەشەوە دەچینە لای فۆکۆ بۆ دەوڵەمەند کردنی باسەکەمان فۆکۆ پێ وایە کۆمەڵگا تەقلیدیەکان یان باشتر بڵێین کۆمەڵگای پێش مۆدێرنیز،ئەو کۆمەڵگایانەن کە دسەڵات تیایاندا لەسەر تەکنیکەکانی سزادان کار ئەکات،هەرچی کۆمەڵگای مۆدێرنەکانە ئەو کۆمەڵگایانەن کە تەکنیکەکانی کۆنترۆڵ تیایاندا بەرقەرارە،هەروەها دەسەڵات کاریگەری هەیە بۆسەر فۆرمی کەسایەتی تەکەکان،کەواتە ئەو دووشێوازەی دەسەڵات دووشێوە جیاوازی کەسایەتی یاخود کارخانەکانی جیاوازی بەرهەمهێنانی خود پێشنیار ئەکەن..دەسەڵات لەکۆمەڵگای سزادا دەسەڵاتێکە ڕوڵە وێرانکردنی جەستە و لەناوبردنی دەکا پشت ئەستورە بە

تەکنیکـەکانی ترسـاندن لـەوێوە خولقانـدنێکی خـودێکی ترسـاو لەهـــــەمو ئاســــتکاندا،بەڵام دەســــەڵات لەکۆمـــــەڵگای کۆنترۆڵدا،دەسەڵاتێکە ڕو لە پێکهاتەی سایکۆلۆژی ڕۆحی ئینسان واتە خولقاندنی خودێك نـەك لەسـەر بنـەمای ترس،بـەڵکو لەسـەر بنـەمای بەرپرسـیاریەتی چـی وەهمـی بـێ یـان ڕاسـتەقینە لـەو کۆمەڵگایانەدا سزا ئەبێتە ڕەهەندێك لە ڕەهەنـدەکانی سـتراتیژیەتی کـۆنترۆڵ تەکنیکـەکانی سـزا دەبـێ هێـزی ئەفسانەیی وتۆقێنـەر ئەبەخشێ تەکنیەکانی چاودێری کۆنترۆڵ،مرۆڤی ئەو کۆمەڵگایانـە لـەو سـاتەدا کـە نـوقم لـەناو پرۆسـەی ناونوسـکردن و پۆلینـە جیاجیاکـانی دەزگـای جۆراوجۆرەکـانی چـاودێری،لە قوتابخانـە ولەشکرو ودەزگای دەوڵەت وکارخانە ومەقەڕەجیاجیاکانی حیـزب وهتد....

لە فەسڵی پێنجەمی کتێبی((مێژوی سێکسوالیەت))دا فۆکـۆ لـە ژێـــر ناونیـــشانی مـــافی مـــەرگ و دەســـەڵات بەســـەر ژیانـــدا دەڵـێ:_(دەســـەڵاتی کـــۆن زیـــاتر لەســـەر بنـــەمای مـــەرگ بنیاتنراوە،مافێکە کە بەهۆیەوە پادشا بۆی هەیە کۆتایی بـەژیانی ڕەعیـەتێك لـە ڕەعیەتـەکانی بهێنێت،مـەرگ لێـرەدا توانایـەك لەتواناکانی دەسەڵات ئەگەرێکە هەمیشە ئامادەیە..

بەلام دەسەلاتی تازە شێوەی دووهەمیان..دەسەلاتێکە لەسەر مەرگ کارناکات بەلکو بەپێچەوانەوە لەسەر خودی ژیان کارئەکات، دەسەلاتێکە ژیان ڕێکدەخات،کۆمەڵێ هێزوتوانا لەناو ئینساندا دروست ئەکات کە سودبەخشن،لەبەردەم دەسەلاتی نوێدا مەرگ ئەوخاڵەیە کە بۆی کۆنترۆڵ ناکرێ،تەحەدایەکە هێزی ئەم دەسەلاتە مۆدێرنە ئەخاتە ژێر پرسیارەوە،ئەو سنورەیە کەکۆتایی بە سنورەکانی دەسەلات دائەنێت..مەرگ ئەوە بەبیری دەسەلات ئەهێنێتەوە کە هێشتا ئامادەیە ودەتوانێ زەرەر لەو((توانا سودبەخشانە بدات کە جەستە هەلگرێت،لەم تێڕوانینەوە مەرگ لەجەوهەردا تەحەدای هێزوتوانای ئیدارەدانی دەسەلاتە نەك تەحەدای ڕەوایەتی ئەو،ئەمەش تەواو پێچەوانەی هەلوێست و دەسەلاتی کۆنە لەبەرامبەر مەرگدا، مەرگ سومبولی بو ئەوە وەبیر ئەهێنایەوە کە پادشایان و ئەمیر لەهەمویان بەهێزترە وخاوەنی ڕەوایەتیەکی تەواو وسەرتاپاگیریە..

فۆکۆ لە باسکردنی بۆ جەستەی سەرۆك یان ئەمیر ئەوە ئاشکرا دەکات ئەم جەستەیە میتافۆر یان ئیستعارەیەکی سیاسی نییە،واتە سومبۆلێك نییە،دەسەلات لەدەرەوەی خۆیەوە وەرگرێت یاخود خۆی ببینێت بە سومبولی دەسەلات لەدەرەوەی خۆیدا،فۆکۆ گواستنەوە لەجەستەی سەرۆکەوە بۆ جەستەی

کۆمەڵگا ئەو گواستنەوەیەی لەسەدەی نۆزدەهەمدا ڕوویدا خـودی ئەو پرۆسەیە کەناوی مۆدێرنیزەی سیاسی لێ نـراوە مـۆدێرنیزەی سیاسـی بـەمانای ئـەوەی ئەوشـتەی کـەدەبێت بپارێزرێـت چـیدی جەسـتەی سـەرۆك نییـە بـەڵکو جەسـتەی کۆمەڵگایـە ئـەوەی لەبەردەمیدا ئەبێ وەلائەتی قوڵی تاکەکان نیشان بـدرێت سـەرۆك نییە..کۆمەڵگایە.خوداوەند نییە بەڵکو پەیمانی کۆمەڵایەتیە،بەبێ ئەوگۆڕانـەش قـسە لەسـەر هـیچ پرۆسـەیەکی مـۆدێرنیزە بکرێـت چـونکە ئـەم گۆڕانەیـە میکـانیزمێکی کـراوە بەدەسـەڵات و پراکتیزەی دەسەڵات ئەبەخشێ.

فۆکۆ لە مەسئەلەی دەسەڵاتی جەستەدا ئەنوسێ:_پاشا چۆن دەسـەڵات بەسـەر ژیانـدا بـسەپێنێ ئەگـەر مـافی کوشـتن نەبێتـە سومبولی هەرە سەرەکی..دەکرێ تـەکنیکی سـەرەکی دەسـەڵاتێ لەسـەر مـەرگ کاربکـات بـە شـانۆگەری کردنـی مـەرگ نـاو ببرێ،مەبەسـتیش لێـرە کەرنـەڤاڵی کوشـتنەکانە،ئاهەنگ گێڕانـە لەسەر جەسـتەی مردوەکـان،کردنی مـەرگ بەمەشـهەدێکی دیـتراو لەنێوان دەسەڵاتی سیاسـی و خەڵکدا،نیشاندانی جەستە،جەسـتە کوژراوەکانە لەسەر شاشەی ( T.V )یەکان..گـەورەترین مەترسـی شـێوە دەسـەڵاتەش خولقانـدنی وابەسـتەی پاشـکۆیەتیەکی کوشەندەیە خەڵك بۆسەرکردەکان کوشتنی هێزی دەستپێشخەری

و ڕۆحیەتی ئۆتۆنۆمیانە،یەکخستنی ئیرادەی کۆ و گۆڕینی مرۆڤ لە تاکەکەسی یان هاولاتیەوە بۆ ڕەعیەت دەسەلاتی کاریزمی بەوەی خۆی وەك دەسەلاتێکی موقەدەس نیشان ئەدات...بۆیە وەکو هەمو موقەدەسێ پێویستی بە قوربانی هەیە،چەند قوربانێکانیش هەم بەژمارە وهەم بە چۆنیەتی زۆر گرنگ بن،ئەوەندە دەسەلاتی کاریزمی خۆی قەداسەت ئەبینێ..لێرەوەیە گوتاری قوربانی گوتاری هەرە بالادەستی کاریزمیە،قوربانی بۆ هەرشتێك بەڕاست بەدرۆ بە پێویستی زیاد قوربانی بوو چەندان مەسئەلەی جیاواز لە نیشتمانەوە بۆ خودی سەرۆك خۆی،دوژمنی هەرەسەرەکی دەسەلاتی کاریزمیش ئەو شێوەیە لە مەعریفە کە بایەخەکان بۆ ژیان ئەگەڕێنێتەوە داوای تەسککردنەوەی ئەقلانی کردنی سنورەکانی قوربانی ئەکات داوای پێناسێکی دیکە وشوناسێکی دیکە بۆ موقودەس.

دەولەتی ڕابەرانی کاریزمی بە مێگەلبوونی خەلك یان زۆربەی ئەو توخمانەی کە دەکەونە ناو قەوارەی دەولەتەوە بەجیاوازی چۆنایەتی و کولتوری تێڕوانینەوە لەم دەولەتانەدا کاریزمە زۆردارێکی ڕەوا وپیرۆز پیادە دەکات،بۆدەستکەوتنی قەوارەیەکی یەککگیر کە تیایدا شوناسێك ئادیایەکی تیۆخیتابێك لە گشتدا بەرجەستە ئەبێ کەزیاتر لە یادەوەریەکی مێژویەوە دەگەڕێتەوە

و پەیوەندی تاك وكۆ دەوڵەت لە پێكەوە لكاندنێكی پیرۆزدا لەڕێی خودی كاریزمەوە كۆدەكاتەوە،ئەم ڕابەرانەش لەقۆناغی مێژوی خەباتی نیشتمانی دژی دەرەوەدا دەركەوتون بەتایبەتی لەناو ئەوتوێژە ڕۆشنبیرە نەكاملە شۆڕشگێڕیەی كە زۆرترین توێژەكانی ژێرەوەی ئەو ئایدیالە پیرۆزە كۆكردوەتەوە یان تەقەلای فۆرمەلەكردنی شوناسێكی نەتەوەی لەنێوان فۆرمەلە كۆمەڵایەتیە پەرش وبڵاوەكاندا..بەبەستنەوەی ئەم خەباتە پیرۆزە شكۆمەندیە مێژویەكانەوە،لێرەوە،ئەم توێژە بەردەوام وحكومە بەپەیوەندی كردنەوە بەیادەوەری مێژوویەوە هاوتاكردنی كاریزمە پاڵەوانە مێژوویە ناوخۆیەكانەوە.

هەمو ڕابەرانی كاریزمەی جیهانی سێهەم لەخیتاب و پرۆژەی ساسیاندا بەتایبەتی لە بانگەشەكردنی روكەشیانەی هەڵبژاردنی ڕێگەی ئازاد لەنێوان دووبلوكی كۆمۆنیستی لیبرالدا واتا هەڵبژاردنی ڕێگەی سێهەم لەنێوان ململانیەكی جیهاندا، بەلام شكستی ئەم ڕێگایە لەڕاستیدا خۆی لەدەرنەچونی ئەم دەوڵەتانەدا بو لەبازنەیەكی ململانییە كەتەنها ئەو ئەگەرەی خستبوە بەردەمیان،ئەگینا لەبنەڕەتدا هەمو خیتابە شۆڕشگێڕەكان كاریزمە لەپشت ئەو تەكنیكە ئابوری وسەربازی و

چەکە گەورانە بوو جەمسەری کۆمۆنیستی و لیبڕاڵی خستبویانە بەردەم ئەم وڵاتانە.

یەکێ لەو وڵاتانەش ڕژێمی بەعس بو کە بەسود وەرگرتن لە هەمو ڕەهەندەکانی سیاسەت و ئابوری و کولتوری توانی بۆ ماوەی لە ٣٥ساڵ کۆمەڵگایەکی ترازیدی و شێوە مێگەلیەك دروست بکات و لەسەر سفرەی کوشتارە گەورەکانی درێژە بە خوێنڕێژترین دەسەڵات بدات وە دوای ئەویش بەرهەمی ئەم دەسەڵاتە لەو پەڕی لوتکەدایە بە ئێستاشەوە کە سیستەمێکی شێوە هاوشێوەی دروست کردوە،ئەستەمە گەلی کوردیش لەم دەوەرانەدا لە بەعسیزم ومناڵ چەتونەکانی دەربازی بێ،کەدوای خۆی شێوەیەك لە کۆمەڵگای قارەمانپەرەستی و ئەهریمەن پەرەستی و چاوچنوکی و مێگەلی لەسەر ئاستە گرنگەکانی ژیان لە دونیای ئێمە دروست کردوە...

## بزوتنەوەکانی فاشیزمو تۆتالیتاریزم لەدونیای هاوچەرخدا

لەدوایی جەنگی جیهانی یەکەم شەپۆلێك لەبزوتنەوەی تۆتالیتاری...تۆتالیتاری کیشوەری ئەوروپای

گرتەوە،کەدژایەتیەکی توندی دیموکراسیان دەکرد وپشتگیریان لەدیکتاتۆریەت دەکرد هەروەها بزوتنەوە فاشیزمیەکانیش هەر لەئیتالیاوە تا بەنزیکەی هەمو ولاتانی ئەوروپای ناوەڕاست ،ڕۆژهەلاتی گرتەوە،لەکاتێکا بەشێکی چێکسلۆفاکیا ئاوارتەیەکی بەرجەستە بوو،لەگەل ئەوەشدا مۆسۆلینی دەستەواژەی دەولەتی تۆتالیتاری پێخۆش بوو،بەلام هەولی نەدا ڕژیمێکی تۆتالیتاری سەرتاپاگیری دامەزرێنێت،وە تەنها بەسەقامگیرکردنی دیکتاتۆریەتی تاك حزبی قایل بوو، لەپێش جەنگی جیهانی دووهەمدا دیکتاتۆریەتی ناتۆتالیتاری لەڕۆمانیا وپۆلۆنیا وولاتانی بەلتیك مەجەرستان پورتوگال ئیسپانیای فرانکۆ لەئارادا بوو.بەلام نازییەکان کە بەهەستی غەریزەییان لەجیاوازی نێوان ئەو دیکتاتۆریانە تێدەگەیشتن.

شەیدای کوێرانە بەشەڕانگێزی وتاوان خەلکی عەوام شتێکی نویێ نییە، زۆرجار دەرکەوتوە کە خەلکی هەرچی وپەرچی بەچاوی ستایشەوە تەماشای کردەوەی توندوتیژی دەکات ودەلێت...هەرچەندە ئەوەش کارێکی ناشایستە وناشیرینە بەلام بەدلنیایەوە کارێکی زۆر بوێرانەیە..هۆکاری گرنگی لەسەرکەوتنی تۆتالیتاریزمدا خۆنەویستی ڕاستگۆیانەی لایەنگرانێتی...هەرچەندە دەشێت نازی یابۆلشەویك لەقنا

بێـت...کاتێـك تـاوان دەرهــەق بەخــەڵکانێك دەکـریێ سـەر بەبزوتنـەوەی نـین نێوچـاوانیش گـرژ ناکـات...کاتێـك دێوەزمـە دەست دەکات بەڕاوکردن وکوشتنی نەوەکانی خۆی...یـان کاتێـك خۆشـی دەبێتـە قوربـانی چەوسـانەوە تەنانـەت لەوکاتەشـدا کـە بەناهـەق تاوانبـار دەکرێـت یـان لـەحیزب دەردەکرێـت وە بـەرەو کاری قـورس یـان ئۆردوگـای گـرتن پـەلکێش دەکـریێ، دیـسانەوە توشـی بـەدگومانی نابێـت بـەڵکو بەپێـچەوانەوە ئـەوەی دونیـای شارستانی سەرسام دەکـات ئەوەیـە کـەئامادەیی تیایـە یارمـەتی تاوانبارەکانی بدات وداوای لەسێدارەدانی خۆی بکات.

ڕەنگـە مایـەی سـاویلکەیی بێـت مـرۆڤ پـیێ وابێـت ئـەو بـاوەڕە سەرسـەختەی بەرامبـەر بـە ئـەزمونێکی کردەیـی خـۆی ڕاگـرت وبەرژەوەنـدی تاکەکەسـی پوچـەڵی کـردەوە گوزارشـتێکی پـەتی لەئایدیایـەکی بەپـەرۆش دەکرد،هەرئایدیایـەك چ منـاڵانـە بێـت یاقارەمانانــە ، بــەردەوام لەقەناعــەت وبڕیــاری شەخــسیەوە سەرچـاوە دەگـریێ وە ملکەچـی ئـەزمون وبەڵگەهێنانـەوە دەبێـت دەمـارگیری بزوتنـەوەی تۆتالیتارێکـان بەپێـچەوانەی هـەموجۆرە ئایدیایــەك لەســاتەوەختێکدا لــەناو دەچــێت کەبزوتنــەوە واز لەلایەنگرە دەمارگیرەکانی دەهێنێت وپشتیان تێدەکات، هەروەها

هەموقەناعەتێك لەناخیدا دەكوژێت كە ڕەنگە لەدوای شكستی خودی بزوتنەوەكەش هەر بمێنیتەوە.

لەهەر جێگایەك جەماوەر هەبێت وە بەرلەهەر هۆیەك لەهۆیەكان ئارەزویەكی زۆری ڕێكخستنی سیاسی تیادا بەدیدەكرێت.بزوتنەوە تۆتالیتارەكانیش ئەگەری بونیان هەیە.

هەر لەدێرینە زەمانەوە تائێستا،یەكسانی نێوان هاولاتیان كەلكەلەیەكی سەرەكی ڕژیمە ستەمگەر وزۆردارەكان بوە،بەلاّم ڕژیمی تۆتالیتار بەو یەكسانیە ناشكێت،بۆیە هێندێك پەیوەندی كۆمەلاّیەتی ناسیاسی وەك پەیوەندی خێزانی خەمی كولتور لەنێو هاولاّتیان دەهێلّێتەوە.

ئەگەر تۆتالیتاریزم پێداویستیە تایبەتێكانی بەجدی وەربگرێت هەتاهەتایە دەبێ كارەكانی بگەیەنێتە پنتێك كە بۆهەتاهەتایە لە بێلایەنی گەمەی شەترەنج رزگاری بێت..

بزوتنەوەی تۆتالیتاریەكان لەو ڕێكخستنە جەماوەریانە دروست دەبن كەخەلّكانی پەرش وبلاّو وگۆشەگیری لەخۆ دەگرێت بەلاّم ئەو خەسلّەتە دیاردەی لەهەمو حیزب وبزوتنەوەكانی دی جیادەكاتەوە..دەبێ هەرتاكێكی تێكوشەر دلّسۆزێكی بێ سنور وبێمەرج ونەگۆڕی بەرامبەر بەبزوتنەوەكەی هەبێت، لەڕاستیدا سەركردەی بزوتنەوە تۆتالیتارێكان پێش ئەوەی دەسەلاّت بگرنە

دەست کاریان لەسەر چەمکی دڵسۆزی کردوە بەشێوەیەکی ئاسایی،بەرلەوەی ڕێکخستنەکانی وڵات بەکردەوە بکەوێتە ژێر دەسەڵاتیان ئەوخواستانە گەلاڵە دەگرێ کەڕێکخستنەکانیان لەکاتی گونجاو ودیاریکراودا توانای هەیە لەسەرجەم ڕەگەزی مرۆڤایەتی بگرێتەوە،لەبەر ئەوەی فەرمانڕوایی تۆتالیتاری بزوتنەوەی تۆتالیتاری ئامادە وفەراهەم ناکات.

بۆیە پێویستە بزوتنەوەی تۆتالیتاری لەدوایی جێگیربونی فەرمانڕەوایی تۆتالیتاری ڕێکبخرێ وهەلومەرجی گەشەکردنیشی بەشێوەیەکی دەسکرد بخولقێنێ، بەمەبەستی دڵسۆزیەکی تەواو...دڵسۆزی تاك وکۆمەڵ لەتواناداا بێت ئەوەش بنەمایەکی سەرەکی باڵادەستی گشتگیرە..ئەمە لەکاتێکا دڵسۆزی لەجۆرە تەنها لەمرۆڤی تەواو گۆشەگیر چاوەڕواندەکرێ.مرۆڤێك لەهەمو پەیوەندیەکی خێزانی،برادەرایەتی،هاوڕێیەتی یان لەهەمو دۆست وناسیاوێکی داماڵڕابێت وەتەنها لەڕێگەی ئینتمای بزوتنەوە یاحیزب هەستدەکات لەم جیهانە جێگای هەیە..وەکو ئەوەی بەدرێژایی ئینتمای حیزبی کوردی وعێراقی وناوچەکە بینیمان وتیایدا بەژدار بوین..ئەمەش بۆخۆی ڕۆح وجەوهەری سەرهەڵدانی بزوتنەوەکانی فاشیزم بون.

بزوتنەوە تۆتالیتارەکان هەریەکەیان بەشێوازی خۆی تائەو شوێنەی لەتوانایدا بێت خۆی لە بەرنامەی حیزب رزگار دەکات بەرنامەیەك کەناوەڕۆکێکی تایبەتی دیاریکراوی هەبێت لەقۆناغەکانی پێش قۆناغی ناتۆتالیتاریەت بەمیراتی بۆی مابێتەوە چونکە هەمو ئامانجە سیاسیە دیاریکراوەکان بەڕاشکاوی جەخت لەسەر مافی سەروەرێتی بەسەر جیهاندا ڕاینەگەیەنێت..هەمو بەرنامەیەکی سیاسی چارەسەری کاروباری تایبەت بکات بەدەر بێت لەو مەسەلە ئایدیۆلۆجیانەی کەدەبێتە جێ بایەخی نەتەوەکان نەبون، یا لەبەرچاو نەگرتنی بەرنامەی حیزب نیشانەی تۆتالیتاریزم نییە...یەکەم کەس خودی مۆسۆلینی بوو پێ وابوو بەرنامە وپلانی سیاسی پارچە وەرەقەیەکی بێ سودە وپەیمانێکی جارسکەرە لەگەڵ شێوازی بزوتنەوە دەسپێکەکانی یەکناگرێتەوە ، فەلسەفە سیاسیە فاشستیەکەش لەسەر چالاکی گەرا وسروشت وەرگرتنی لەخودی ساتە وەختی مێژو بونیان نابوو،سەبارەت بەنیازیش چلێسی دەسەڵات تێکەڵ بە نەفرەتی چەنەبازی زۆر لەتایبەتمەندێتی هەمو ڕێبەرانی هیچ وپوچ بوە بەڵام لەگەڵ تۆتالیتاریزمدا یەکناگرێتەوە.

ئامانجی ڕاستەقینەی فاشیزم تەنها دەسەڵات گرتنە دەستە ودەستبژێری فاشیزمیش بۆ چەندوچون سەرکردایەتی وڵات بکات.واتە لەمیانەی دەوڵەت وپشت بەستن بەئامێری توندوتیژی چونکە تۆتالیتاریەت بەهۆی ئایدیۆلۆژیا سەیر وبێهاوتاکەی ئەو ڕۆڵەی بەدەزگای فشاردا وازیدەکات،ئامرازی کۆنترۆلکردنی لەدەرونی مرۆڤدا ئاشکرا کرد.

## بزوتنەوەی تۆتالیتێر

لەوڵاتە تۆتالیتارەکاندا تیرۆر هەڵمەتی پڕۆپاگەندە وەك دووڕوی دراوێك پێکەوە پەیوەستن ئەم دیدەیەش تەنها بەشێك ڕاستی تیایە هەرکاتێك تۆتالیتاریزم دەسەڵاتی ڕەها پەیدا دەکات پروپاگەندە بە تەلقینی بیروڕا دەگۆڕێتەوە توندوتیژیش زیاتر بۆبەدیهێنانی بیروباوەڕە ئایدیۆلۆژی وسەلماندنی درۆە کردەییەکانی بەکار دەهێنێ.تا ترساندنی خەڵکی لەسەرەتای دەسەڵات گرتنە دەست نەبێت بەدەگمەن توندوتیژی پیادە دەکات ئەویش کاتێ ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لەئارادا بێت.

هەڵمەتی پڕوپاگەندە گرنگترین ئامراز نییە لەدژی دونیای ناتۆتالیتار بەکار دەهێنێت بەپێچەوانەوە،تیرۆر بەگەوهەری

ڕاستەقینەی ئەو جۆرە حکومەتانە دەژمێردرێت هەروەکو بونی قانون لەسیستمی دەستوریدا بەژمارەی ئەو کەسانەوەپەیوەست نییە کەقانون پێشێلدەکەن بونی ڕژێمی تۆتالیتاریش پەیوەستی بەهۆکارە خودی دەرونی یان هۆکارەکانی دییەوە نییە.

پروپاگەندەی تۆتالیتایزم عەلمانیەتی ئایدیۆلۆژی وهونەری وپەیامبەری بۆئاستێکی لەچالاکی میتۆدی بێ ناوەڕۆك بەرزکردەوە کەپێشتر نەزانرابوو،چونکە لەنەریتی دیماگۆگیەتدا باشترین شێواز بۆدورکەوتنەوە لەگفتوگۆ ئەوەیە کە بوترێ تا داهاتوو ڕاستی ئەو وتانە دەسەلمێنێت.

پرۆپاگەندەی تۆتالیتاریزم زۆر لەسەر پایەی فریودانی خەڵکی پایەدار نییە.بەڵکو سەرکەوتنی زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو وشیاریەی کەبەرژەوەندی وەك هێزێکی هەمەلایەنە تەنها کاتێك هەستی پێ دەکرێ کەئۆرگانی سیاسی سەقامگیر هێڵی پەیوەندی پەیوەست لەنێوان تاك وکۆمەڵ دەستەبەر بکات،پابەند بون بەسەرکردەی تۆتالیتاریش بێهەڵە ئەوەندەی لەسەر ڕاڤەکردنی دروستی هێزە باوەڕپێکراوەکانی مێژوو یاسروشت بونیات نراوە ئەوەندە لەسەر وشیاریەکی نائاسایی بونیات نەنراوە...کاتێك سەرکردەی جەماوەری دەسەڵات دەگرێتە دەست جگە لەخەمی

هێنانەدی پێشبینیەکانی کەهەمو بەها سودگەراکانی دی لەخۆی دەگرێت غەمێکی دی نییە.

لەنێو بردنی مرۆڤەکان بەپێی پرۆسەیەکی مێژوویی ئەنجامدەدرێ کە لەوپرۆسەیەدا ئەوەی بەسەر مرۆڤدا دێت بمانەوێ ونەمانەوێت بەپێی یاسایەکی نەگۆڕ هەردەبێ ڕوبدات،کوشتنی قوربانێکان بەدیهاتنی پێشبینیەکانی دونیای غەیبانیەتە..جگە لەو ڕوداوانەی پێشبینیکراوە هیچ ڕوداوێکی دی ڕونادات،چ جیاوازیەك یاساکانی مێژوو زەنگی نەمان بۆ چینە حوکمدارەکان،نوێنەرەکانیان لێبدات یاساکانی سروشت ئەو ڕەگەزانەی کە لەهەمو ڕویەکەوە شایستەی ژیان نین لە نێوبەرێت.

دیموکراسی یەهودی مرۆڤە نەوەییەکانی ئەوروپای ڕۆژهەلات یان ئەو نەخۆشانەی چارەسەریان نییە...هیتلەریش بەڕێکەوتنێکی سەیر لەسەر چینی ڕوو لەمەرگ ئەوانەی دەبێ بە بێدەنگی لەناو ببرێن قسەی کردبوو...میتۆدی پروپاگەندەی تۆتالیتاری کە بەپێ پێشبینیەکانی چارەنوسی دوژمنیان ولەنێوبردنیان دیاردەکات وەك هەمو میتۆدەکانی پروپاگەندەی تۆتالیتاری لەدوایی دەسەلات گرتنە دەست بەتەواوەتی کارپێدەکرێ گفتوگۆکردن دەربارەی پێشبینیەکانی دیکتاتۆر

بەئەندازەیەك ناسروشتیە وەك ئەوەی بێ گفتوگۆ لەگەڵ پیاوکوژێك بکەی لەسەر ئەوەی قوربانییە تازەکەی زیندوە یان مردوە.چونکە پیاوکوژەکە هەر بەکوشتنی قوربانیەکەی دەتوانێت بە زوویی ڕاستی قسەکانی بسەلمێنێت.

هەروەها لەتەکنیکی پروپاگەندەی تایبەت بەجەماوەر،بەدیار دەکەوێت بەڵام نە داهێنانی تیا دەکات ونە ناوەڕۆکی بۆ دەخولقێنێ.

بزوتنەوە تۆتالیتارەکان پێش ئەوەی دەسەڵات بگرنە دەست سروش بۆ دامەزراندنی جیهانێك دەکەن لەگەڵ بیروباوەڕیاندا یەکانگیر بێت، دونیایەکی خەیاڵ وڕەگەز هارمۆنی کەپێداویستیە دەرونێکانی مرۆڤ لەخودی واقع باشتر دەستەبەر بکات،چونکە جەماوەری بێ ڕەگ وریشە تەنها ڕێگەی خەیاڵێکی پەتیە وهەست بەئۆقرەیی دەکات وە لێدانە بێ کۆتاییەکانی دەپارێزێت کەژیانی واقعی ئەزمونەکانی ڕوبەڕوی مرۆڤ وئارەزوەکانی دەکاتەوە...بۆیە هێزی پروپاگەندەی تۆتالیتاری لەتوانا مەزنیەتی کەپەیوەندی نێوان جەماوەر وجیهانی واقعی لێکدابڕابێت ئەویش پێش ئەوەی بزوتنەوە دەسەڵاتی ئەو پەیدا بکات بەرامبەر بەهەر کەسێك بخوازێت بەپنتێك لەواقعیەت وئارامی ئەوجیهانە ترسناکە وێناکراوە بشێوێنێت پەردەی ئاسنین دەداتەوە.

تـەنها لـەکاتی شکـست دا پروپاگەنـدەی تۆتالیتـاری ئاشـکرا دەبێت چونکە کاتێك بزوتنەوە هێز وتوانـای لەدەسـت دەدا ئیـدی ئەندامەکانی دەمودەست پـشت دەکەنـەوە ئـەو بیروباوەڕەی کـە تادێریکی ئامـادە بـون گیـانی خۆیـانی لـەپێناودا بەختبکـەن.لەو ساتەوەختەی بزوتنەوە لەبەر یەك هەڵدەوەشـێتەوە ودادەرۆخێـت واتە ئەوجیهانە ساختەیەی پـشتوپەنایان بۆجـەماوەریش بۆپێگـە سەرەتایەکەی جارانی کەدەگەڕێتەوە پێگەی خـەڵکانی گۆشـەگیر بوو یادوبارە ڕودەکەنە دونیا نائومێدە کۆنەکەی خۆیان کەدونیای خەڵکانێکی بێ فەڕبوو.

خەسـڵەتێکی دی نمونـەی تۆتالیتـاری ئەوەیـە کـەبتوانێت بـەردەوام خـۆی دوبارەبکاتـەوە ڕێکخستنیش لەحاڵـەتێکی نـەرم بهێڵێتەوە،ئەوحاڵەتـەی ڕێگـەی پێبـدات هەمیـشە تویـژی نـوێ بهێنێتە ڕیزەکانیەوە وپلـەی نوێ لەخـەبات وتێکوشـانیش دیـاری بکات...ئەرکی باڵای سەرکردەیش ئـەرکێکی دوانـەیی بەرجەسـتە دەبێـت کـە هـەمو پێکهاتـەکانی بزوتنـەوەی پێدەناسـرێتەوە لەلایـەکی دیکـە دەبـێ وەك بـەرگریکارێکی سـیحراوی بزوتنـەوە بەرپەرچی دەستدرێژیەکانی جیهانی دەرکی بداتەوە لەلایەکی دی پێویستە پردێکی ڕاستەوخۆ بێت کە لەڕێگـەی خۆیـەوە بزوتنـەوە بەجیهانی دەرکی ببەستێتەوە.

# دەسەلآت وتۆتالیتاریەت

ناکۆکی تۆتالیتاریزم لەسەر کورسی دەسەلآت لەو پانتاییە پراکتیکیەی جوڵەی تیادەکات لەوەدایە کەخاوەندارێتی هەموو ئامرازەکانی دەسەلآت وتوندوتیژی لە ولآتێکدا خەسڵەتی ڕەهای نییە،سوکایەتێکردنی بزوتنەوە بۆواقع ولایەنگری سەرسەختانەی لەیاسایی جیهانێکی ساختە دوو ئەرکە زۆر بەزەحمەت تاسەر پارێزگاری لێ بکرێ،چونکە جەوهەری هەنوکەش هەر وەکو چۆن جەوهەری دوێنێش بون لەبەر ئەوەی دەسەلآت لەحکومەتی تۆتالیتاریدا بەمانای ڕوبەڕوی واقع دێت، بۆیە دەبێ تۆتالیتاریزم لەدەسەلآتدا ئەم ڕوبەڕوبونەوەیە،بۆیە بەرەنگاربونەوەیەك بەردەوام بەرزبکاتەوە...گەیشتن بەدەسەلآتیش سروشتی بەرپرسیارێتی سروشتی حیزبە شۆڕشگێڕەکان بەقوڵی دەگۆڕێت،ئەزمون وعەقڵی دروست گرنتیە کەخەڵکی والێدەکات پێشبینی ئەوە بکەی کەتۆتالیتاریزم لەدەسەلآتدا هێدی هێدی پەرۆشی شۆڕشگێڕی لەدەست داوە.

–لەخەسڵەتە تۆباوییە سەرەتاییەکانی دوردەکەوێتەوە.یەکێك لەگرنگترین جیاوازی نێوان بزوتنەوەی تۆتالیتاری ودەوڵەتی تۆتالیتاری ئەوەیە کەدیکتاتۆری تۆتالیتاری دەتوانێت ودەبێت

هونـــــــــەری درۆی تۆتالیتــــــــاری بەشــــــــێوازێکی گونجاوتر،کاریگەرتر،بەرفراوانتر لەڕێبەری بزوتنەوە بەکاربهێنێ.

درۆکردنی سیستماتیك بەرامبـەر بەهـەمو جیهـان تـەنها لەسـایەی هەلومەرجی دەسەڵاتی تۆتالیتاریدا بێ ئاکـام ئەنجامـدەدرێ واتـە لەسـایەی هەلومەرجێکـدا کەسـاختەی سـیمای واقعـی ڕۆژانـە هەڵمـەتی پرۆپاگەنـدە بـێ سـود وبـێ کـەڵك دەکـات...بزوتنـەوە تۆتالیتارەکـان پـێش ئـەوەی دەسـەڵات بگرنـە دەسـت هـەرگیز نەیانــدەتوانی بـــەم ئەندازەیـــە ئامانجـــە ڕاســـتەقینەکان بشارنەوە.ڕێبەری تۆتالیتار تاچەند قەناعەتی ڕەهایان بەوە هەبێ کەپێویستە شێلگیرانە بەردەوام بن لەسەر ئەفسانەی تۆتالیتـاری پرنـسیپی ئـەو جیهانـە سـاختەیەی لـەکاتی جەنگدا بەمەبەسـتی دەسەڵاتگرتنە دەست گەڵاڵە دەکرا هێدی هێدی مانـا وپرنـسیپە تـەواوەکانی ئـەم جیهانـە ساختەشـیان ئاشـکرا دەکـرد چـونکە ئیمـامی ڕێبـەرانی تۆتالیتـار بەتوانـەوەی هەمەلایەنـەی مـرۆڤ وە بـاوەڕی تـەواویان بـەوەی کـەدەتوانرێ هـەمو کارێـك لەڕێگـەی ڕێکخستنەوە ئەنجام بدرێ بـەرەو ئـەزمونێکی دەبـردن، کەڕەنگـە خەیاڵی مرۆڤ بتوانێ هێڵە سەرەتاییەکانی دیـار بکـات بـێ ئـەوەی چالاکی مرۆڤ بەدیبهێنێت..کۆمەڵگـەی نهێنی پـۆلیس یـان نهـێنی یاســەربازی سیاســی یاتێکوشــەرانی مەشــقیدەی ئایــدیۆلۆژیا

بەمەبەستی ئەوە دروست دەبن تا لەڕێگەی ئەوانەوە توێژینەوەی ئەزموونی وناشیرینی تۆتالیتاری دەربارەی سنوری توانای کار بەرەو ئەزمون وپراکتیکی بەرێت.

لەلایەکی دی پیلانگێری تۆتالیتاری لەدژی جیهانی ناتۆتالیتاری بانگەشەی بالآدەستی بەسەر جیهاندا لەسایەی هەلومەرجی حوکمێکی تۆتالیتاریدا،هەر وەك چۆن لەبزوتنەوە تۆتالیتارەکاندا پێشنیاز دەکرا بەئاشکرا وکراوەی دەمێنێتەوە فەرمانڕەوایی تۆتالیتاری چەمکی پیلانگێڕی بەسەر دانیشتوانی لایەنگەرە سەربازەکانی لەسەر ئەوگریمانەیە پراکتیزە دەکات کەپیلانێك لەلایەن هەموو جیهانەوە لەدژی ولآتەکەیان لەئارادایە بنەمای پلان دژی پیلان بەرجەستە دەبێ.

## قۆرخ کردنی گشتی

بالآدەستی گشتگیر هەولدەدا مرۆڤەکان جۆرێك ڕێکبخات کەفرەیی وجیاوازی تاکۆتاییان لەنێوبەرێت وەکو ئەوەی هەموو مرۆڤایەتی کەسێك بێت،ئەمەش تەنها کاتێك لەتواناد‌ا دەبێت کە یەك بەیەکی مرۆڤەکان بەرامبەر هەندێك چالاکی دیاریکراوی پەرچەکرداری دیاریکراو نەگۆڕ پشان بدەن بەمشێوەیە هەر کۆمەلێك لەکۆمەلێك پەرچەکردارانە دەرفەتی ئەوەی دەبێت

بۆکۆمەڵێکی دی بگۆڕێت،بەزەحمەتی هاتنە دی ئەم باڵادەستیە بریتیە لەدروستکردنی شتێك کەبونی نییە،واتە دروستکردنی جۆرە مرۆڤێك لەگەڵ ئاژەڵەکانی دی هاوجۆر بێت وتەنها یەك ئازادی هەبێت ئەویش پارێزگاری کردنە لەجۆری خۆی...تۆتالیتار هەوڵدەدا لە یەك کاتدا بەدوو ڕێگە بەم ئامانجەی بگات:

یەکەم:لەڕێگەی ئامادەکردنی ئایدیۆلۆجیانەی دەستەبژێر

دووهەم:لەڕێگەی تیرۆری ڕەها لەئۆردوگاکاندا....لەراستیدا ئەو درندایەتیەی پێکهاتەی دەستەبژێر دەینوێنێت پراکتیزە کردنی تەڵقینی ئایدیۆلۆجیانە وپێویستە بەجۆرێك ئەزمونی پراکتیکی بژمێردرێت بۆئەوەی شایستەی خۆی بسەلمێنێت ئەمە لەکاتێکدا پێویستە دیمەنی ترسناکی ئۆردوگاکان وەك سەلماندنی تیۆرەی ئایدیۆلۆجیانەی تۆتالیتار وەربگرێت.

ئۆردوگاکان تەنها بۆ لەنێوبردن وسوکایەتیکردن بەمرۆڤ دروست نەکرابون بەڵکو کاریشیان ئەوە بوو لەسایەی هەلومەرجێکدا کە بەڕووکەش لەڕوی زانستیەوە لەژێر چاودێریدا بوو..هەرەمەکی وەکو ئەوەی گوزارشت لەهەڵسوکەوتی مرۆڤ دەکات لەناخی مرۆڤدا لەنێو بەرن کەسایەتی مرۆڤیش بەشتێکی ڕوت بگۆڕن بیکەنە بەشتێك لەئاژەڵیش نەچێت چونکە وەك دەزانین سەگەکەی پاڤلۆڤ بەجۆرێك پەروەردەکرا بوو تەنها

بەبیستنی زەنگ خواردنی دەخوارد نەك لەبەرئەوەی برسی بوو بەڵکو پەروەردە کرابوو بۆیە ئەم سەگە ئاژەڵێك بوو کە چیەتی گۆڕابوو.ڕێگەی گەیشتن بەتۆتالیتاریزم بەگەلێك قۆناغی ناوەندیدا تێدەپەڕی کەدەتوانین زۆر لێکچون پێشینەی جۆراوجۆر لەنێوان خۆی وقۆناغی تۆتالیتاری گشتگیردا بەدیبکەین بێگومان تیرۆری خوێناوی وترسناك لەیەکەم قۆناغی باڵادەستی تۆتالیتاردا بۆ هێنانەدی یەك چارەنووس ترخان دەکرێ.ئەویش شکست بەنەیار بهێنرێت وە هەموو ئۆپۆزسیۆنێك لەدوارۆژدا بەئەستەمبکرێ بەڵام تیرۆری گشتگیر لەدوایی بەسەر چونی قۆناغی یەکەم دەست پێ دەکات.ڕێك ئەوکاتەی ڕژێم بترسێ لەهەڕەشەی ئۆپۆزسیۆن نامێنێت لەم ناوکۆیەدا زۆرجار ئاماژەمان بەوە کردوە کەخودی ئامرازەکان دەگۆڕێ بەئامانج بەڵام دواجار لەسایەی ناکۆکی جیاوازیدا تەنها ئەوەمان پێ قبوڵە کە گوزارەی ئامانج پاکانەی ئامراز دەکات چیدی کارێکی شیاو وگونجاو نییە خۆی لەدەست داوە بەوەی چیدی ئامرازی خەڵك ترساندنی نییە.

ئۆردوگاکانی گرتنی بەکۆمەڵ گرنگترین دژەکانی ڕژێمی تۆتالیتار بوو،کەواتە ڕاکردن لەهەمیشە بیرکردنەوە لەنەگریس...بۆ تێگەیشتن لەجەوهەری تۆتالیتاری کارێکی مەحاڵە...بەڵام یادەوەرییەکانی ئەوئۆردوگایانە ناتوانێت هەمان

کار ئەنجام بدات کەراپۆرتێکی بڵاونەکراوەی شاهیدێك دەتوانێت ئەنجامی بدات.

بیرکردنەوە لەترس بەتەنها ناتوانێت هیچ جۆرە گۆڕانێك لەکەسایەتی مرۆڤ دروست بکات،هەروەك چۆن ئەزمونی واقعی ترسیش گۆڕانکاری بنەڕەتی لەکەسایەتی مرۆڤ ناخولقێنێت... گۆڕینی مرۆڤ بەکۆمەڵێك پەرچەکردار چەشنی نەخۆشیەکی دەرونی بەتەواوەتی لەهەموو شتێکی جیادەکاتەوە کە کەسایەتی وخەسڵەتی پێکدەهێنێ بەڵام هەرکاتێك چەشنی لازارۆس لەجیهانی مردوەکان هەڵدەستێتەوە،ئێدی کەسایەتی یان خەسڵەتی پێش زیندوبونەوەی چۆن بو،وەك خۆی بەبێ گۆڕانکاری دەمێنێتەوە.

خەیاڵی لێوان لێو لەترس ئەوجیاکاریە مەزنەشی هەیە کەدەتوانێت زۆرێك لەراڤەکردنە دیالەکتیکی وسیاسیە ئاڵۆزانەی لەسەر خورافەی چاکە لەخراپە دەکەوێتەوە پایەدارە.دەکاتە بلۆقی سەرئاو،ئەم جۆرە سێرکی دیالەکتیکە کاتێك کەمێك پەسەند دەکرێ مرۆڤ بتوانێت دزێوترین بەلا بەسەر مرۆڤێکی دی بهێنێت ئەویش کوشتنی بوو، بەڵام ئەمرۆ بەرەهای دەزانین کوشتن بەئاسایترین شەڕەنگێزی دەژمێردرێت،پیاوکوژێك کەمرۆڤێك دەکوژێت لەهەمو حاڵەتێکدا دەبێ بمرێ هێشتا لەو مەیدانی مردن

وژیانەی لەلای هەموان ئاشنایە هەنگاو دەنێت چ بکوژ وچ کوژراو جۆرە پەیوەندیەکی زەروریان پێکەوە هەیە کەدیالەکتیکی خۆی لەسەری ڕاگرتوە،تەنانەت ئەگەر هەردووکیان پەیوەندیەکی وشیارانەشیان لەنێوان نەبێت جەلاد وجەستەی کوژراوێك لەدوای خۆی بەجێدەهێڵێت وە هەرگیز بانگەشەی ئەوەش ناکات قوربانێکەی بونی نەبوبێت،تەنانەت ئەگەر شوێنەواری تاوانەکەش لەناو بەرێت ئەو شوێنەوارەیە کەپەیوەندی بەناسنامەی خۆیەوە هەیە نەك بەیادەوەری وخەم وخەفەتی ئەو کەسانەی دۆستایەتیان لەگەڵ قوربانییەکەدا هەبوە،بکوژ ژیانی تاکێك لەناو دەبات بەڵام ناتوانێت واقعیەتی بونی لەناو بەرێت.ناتوانێت هیچ شتێك بەژیانی ناو ئۆردوگاکان بەراوردبکرێن بەڵام درێوی وناشیرینیەکانی ئەوئۆردوگایانە هەرگیز بەخەیاڵدا نایەت لەبەر ئەوەی لەودیوی ژیان ومردندا جێگەی خۆی کردۆتەوە،هەروەها ناشتوانرێت بەتەواوەتی گوزارشت لەو درێویانە بکرێت چونکە ئەوانەی لەو ئۆردوگایانە رزگاریان بوە بۆ جیهانی زیندوەکان گەڕاونەتەوە تەنانەت لەتوانایاندا نییە خۆشیان بڕوا بەئەزمونی ڕابردویان بکەن وەك ئەوەی داستانی ئەستێرەیەکی دی بگێڕنەوە،چونکە لەدونیای زیندوەکان هیچ کەسێك زانیاری لەسەر ژیان ومردنی زیندانێکان نیە وەك ئەوەی هەرگیز لەدایك نەبوبن.

مرۆڤـە دەسـت بەسـەرگیراوەکان بەشـێوەیەك لەئۆردوگاکەیانـدا مامەڵـەیان لەتەکدا دەکرا وەك ئـەوەی هـەرگیز بونیـان نـەبوبێت کەسێ بەلایەوە گرنگ نەبوو چییان بەسەر دێـت یـەك سـەر مۆری مردنیـشیان لێـدەدرا وەلـێ ڕۆحێکـی ئەهریمـەنی پـێش ئـەوەی بۆژیانی هەتاهەتایان بەرێت لەسنوری نێوان ژیان ومردندا گەمـەی پێیان دەکرد.

## تۆتالیتار وەك سیستەم

لەمێـژووی فیکـری سیاسـیدا،ئایدیای حکومـەتی تۆتالیتـاری هەرگیز لەئارادا نەبوە،چونکە شێوازی ئـەو حکومەتانـەی خـەڵکی لەسایەیدا ژیاون وگەلێك کـەم بوون،ئـەو شـێوازانەش زۆر دەمێکـە لەڕێگـەی بیرمەنـدانی یۆنانیـەوە ئاشـکرا وپلەبەنـدی کـراوە زۆر دەمێکیشە تائاستی نامۆبون بۆیان ڕون بوەتەوە ئەگەر ئێمـە ئـەو فۆرمە سیاسیانەی کەبونیادی ئایدیایان سەرباری ئـەو گۆڕانکاریـە زۆریانەی بیست سەدەی ڕابردوو هەر لەئەفلاتۆنەوە تا کانـت هـیچ گۆڕانکاریـەکی سـەرەکی بەسـەر نـەهاتوە بەتۆتالیتاریزمـەوە بەراوردبکرێن ئینجا دوچاری ئەو وەسوەسەیە دەبینـەوە کـە وەك فۆرمێکی تازەی ستەمگەری گوزارشت لـەتۆتالیتاریزم بکەین،واتـە

رژیمێکی بێ یاسا کە تاکەکەسێك دەسەڵات قورخ بکات،دەسەڵاتی هەرەمەکیانە کە بەیاساوە دەربەست نەبێت وبەپێ بەرژەوەندی ستەمگەر ولەدژی بەرژەوەندی فەرمانبەران کاربکات لەسەر پایەی ترسی خەڵکی لەفەرمانڕەوا وترسی فەرمانڕەوا لەخەڵکی ڕاوەستاوە.لەنەریتی سیاسی ئێمەدا ئەم ترسە دوولایەنە سیمای سەرەکی حکومەتە ستەمگەرەکان بوە.شەرمەزاری تۆتالیتاریزم کە بەرەنگاری هەمە جۆری یاسایەکی دانراوە دەبێتەوە لەڕێگەی حوکمێکی ڕاستەوخۆوە بانگەشەی دەستەبەرکردنی دادپەروەری لەسەر ڕوی زەوی دەکات.یاسای مێژوی یا سروشتی پیادەکات بەبێ ئەوەی هیچ کامیان سەبارەت بەهەڵسەکەوتی تاك بۆ پێوەری چاکە وخراپە وەرگیرێت..ئەم مەشروعیەتەش بەبێ ئەوەی هەڵسوکەوتی خەڵکی بەهەند وەربگرێت یاسایی سروشتی ومێژوو ڕاستەوخۆ بەسەر مرۆڤدا پیادەدەکات.سیاسەتی تۆتالیتاریزمی زنجیرەیەك یاسا لەجێگەی زنجیرەیەك یاسای دی دادەنێت وڕێکەوتنێکی یاسایی تایبەت بەخۆیشی دانەمەزرێنێت لەپێناوی بەرژەوەندی شۆڕگێڕا فۆرمێکی نوێ شەرعیەت داناهێنێت...تۆتالیتاریزم بەرەنگاربونەوەی هەموو یاسا دانراوەکان بەیاسا تایبەتێکانی خۆشیەوە بیر لەتێپەڕاندنی هەمو ڕێکەوتنێکی یاسایی دەکاتەوە،بێ ئەوەی ملکەچی بارودۆخی

نایاسایی وهەرەمەکی ترس ودەوڵەتێکی دیسپۆتیزمی بێت چونکە بەڵێنی داوە بەجێبەجێکردنی یاسا لەکۆت وبەندی هەرجۆرە کارێك یا ویستی مرۆڤ ئازاد بکات تۆتالیتاریزم پەیمان دەدا عەدالەت لەسەر ڕوی زەوی بەدی بهێنێت لەبەر ئەوەی بانگەشەی ئەوە دەکات کەدەیەوێت ڕەگەزی مرۆڤ والێبکات بەرجەستەی یاسایی مێژووی وسروشت بکات.تیرۆر بریتیە لە بەدیهێنانی یاسایی بزوتنەوە ئامانجی سەرەکیشی ئەوەیە کە کارێك بکات تا هێزی سروشت یا مێژوو بتوانێت بە پێشێلکردنی ڕەگەزی مرۆڤ ئازادانە بۆ پێشەوە تاو بدات،بێ ئەوەی هیچ جۆرە کارێکی هەرەمەکیانەی مرۆڤ بتوانێت لەتاودانی بکرێت بۆیە تیرۆر بۆئەوەی هێزی سروشت یامێژوو ئازاد بکات،هەوڵدەدات مرۆڤ لەشوێنی خۆی بەند بکات ئەو بزوتنەوەیە دوژمنانی مرۆڤایەتی دەستنیشان دەکات.

بۆ ئەوەی جەڵەوی تیرۆر لەدژیان شل بکات بۆیە هیچ کارێکی ئازادانە ئێدی چ دوژمنکارانە بێت یا لایەنگرانە...ڕێگەی پێ نادرێ...بەربەستێك لەنێو بردنی دوژمنانی بابەتی مێژوو یا سروشت دوژمنی چینی یاڕەگەز دروست بکات،ئێدی لێرە بەدواوە بێ گوناهی وگوناهکاری دەبن بە دووچەمکی بێ مانا وبێ ناوەڕۆك،گوناهکار ئەو کەسەیە کەڕێگرە لەبەردەم پرۆسەی

سروشـــت یـــا مێـــژوو ئـــەو پرۆســـەیەی حـــوکم لەســـەر رەگـــەزە نزمەکان،ئـەو تاکانـەی شایـستەی ژیـان نـین ئـەو چینانەی ڕوو لەمەرگن ونەتـەوە سـوك وریـسواکان دەردەکـات...لـەم حاڵەتانـە تیرۆر ئەو حوکمانە جێبـەجێ دەکـات وە لەدادگاشـدا چ کـوژراو چ بکـوژ لـەڕوی زەینیـەوە خۆیـان بێگونـاهـ دەزانـن قوربانێکـان بێگونـاهن چـونکە هـیچ کارێکیـان لـەدژی ڕژێـم ئـەنجام نـەداوە وبکوژەکانیش گوناهیان نییـە چـونکە تـەنها فـەرمانی مردنێکیـان جێبەجێکردوە کەدادگای باڵا دەریکردوە تەنانەت فـەرمانڕەوایانی تۆتالیتاریش بانگەشەی دادوەری یان حەکیمی ناکەن،بەڵکو تـەنها یاسای سروشـت یـان مێـژوو جێبەجێدەکـەن ئەوانـە خـودی یاسـا پیادە ناکەن بەڵکو بزوتنەوەیەك بە پێ یاسـا خـۆی دەهێننـە دی لەم ناکۆکیەشدا تیرۆر دەبێت بەشەرعی.

ئەگەر یاسا ببێ بەیاسای جوڵەی هێزێکـی بـانمرۆی واتـە هێـزی سروشـت یـان هێـزی مێـژوو.لێرەشـەوە جیـاوازی نێـوان ڕەوشـی مێژوگـەرایی مـارکس وڕەوشـی سروشـت گـەرایی داروین زۆر جـار بەسـودی مـارکس نیـشاندراوە وە خراوەتـە ڕوو هـەر ئەمـەش وادەکات ئەوە پشتگوێ بخەین کە تاچ ئەندازەیەك مارکس سـودی لەتیۆرەکەی داروین وەرگرتوە.مەبەستی ئنگلسیش لـەناو لێنـانی مارکس بـە داروینـی مێـژوو زیـاتر ڕێزلێنـانێکی پـەتی بوو،چـونکە

لەواقعیەتدا دەیویست پشکی داروین لەدەستکەوتەکانی مارکسدا بخاتە ڕوو، ئەگەر کەسێك فەلسەفەی سەرەکی ئەو دوومرۆڤە لەبەر چاو بگرێت بۆی دەردەکەوێت کەبزوتنەوەی سروشت وبزوتنەوەی مێژوو لەواقعدا یەك شتن...داروین بەداهێنانی چەمکی گۆڕان لەسروشت دان پێداگرتنی لەسەر ئەوەی کە جوڵەی سروشت بەلانی کەمەوە لەبواری بایەلۆجیدا بازنەی نییە بەڵکو تاکە هێڵە وتا ناکۆتاش گەشە دەکات لەواقعدا مانای ئەوە دەگەیەنێ کەمێژوو لەزاتی خۆیدا سروشت قووت دەدا وبەشێوەیەکیش سەیری ژیانی سروشتی دەکرێ وەك ئەوەی لەجەوهەردا مێژوویی بێت.تیۆر وەك ئامرازێك بەدیهێنانی یاسای بزوتنەوە کە دوائامانجی خۆشگوزەرانی مرۆڤ کە تاك بۆ بەرژەوەندی جۆر لەنێو دەبات وە لەپێناوی گشتدا قوربانی بەبەشی دەدات لەبەر ئەوەی هێزی بانمرۆیی مێژوو یاسروشت سەرەتا وکۆتای هەیە،بۆیە تەنها سەرەتا وکۆتای ژیانی تاك ناهێڵێت ئەم پرۆسەیە بەئاکام بگات،شتێکی ڕون وئاشکرایە کەئەمەش سەرەتا وکۆتای خودی ژیانی مرۆڤە.تیۆری گشتگیر مرۆڤەکان والێدەکات یەکتری بهاڕن بەوەش مەودای نێوانیان لەنێو دەبات ئەگەر بازنەی ئاسنینی تۆتالیتار کەمرۆڤەکان بەتوندی پێکەوە دەبەستێتەوە لەگەڵ بیانی ستەمگەری بەراورد

بکرێ...بیانی ستەمگەری وەك زامنکاری ئازادی بەدیار دەکەوێت چونکە لەم بیابانەدا بەلانی کەمەوە پانتایەك لەنێوان مرۆڤەکان دەمێنێتەوە کاری حکومەتی تۆتالیتاری بەتەنها بنبڕکردنی ئازادی یان لەنێوبردنی ئازادییە سەرەتاییەکان نییە،ئەگەرچی تا ئەوجێگەیەی ئێمە ئاگادار بین لە بنەبڕکردنی خۆشەویستی لەدڵ ودەرونی خەڵکیدا نابێت...بەڵکو ئەم جۆرە حکومەتە مەرجی سەرەکی لە هەموو ئازادیەك واتا پانتای پێویست بۆ جوڵەی تاکە کەسیش لەناو دەبات.بونی تیرۆری گشتگیر...کەجەوهەری ڕژێمی تۆتالیتارە.

نە لەپێناو نە لەدژی مرۆڤەکان...بەڵکە ئەمجۆرە تیرۆرە زیاتر بۆ ئەوەیە کاریگەرترین ئامراز بۆ خێراترکردنی جوڵەی سروشت یا مێژوو فەراهەم بکات.تۆتالیتاریزم لەگەڵ بازنەی ئاسنینی تیرۆر فرەڕەنگی مرۆڤ لەنێو دەبات وە تاکێك لەو فرە ڕەنگیە دروست دەکات ئەو تاکەی دادەهێنێت بەشێوەیەك ڕەفتار دەکات وەك ئەوەی خۆی بەژداری لەڕەوتی مێژوو یاسروشت بکات..بەهەمان شێوە تیرۆری تۆتالیتار بەتەنها هێزی مێژوو یا سروشت ئازاد ناکات...بەڵکو تاودانێکی ئەوتۆیان پێ دەدا تەنانەت ئەگەر بەتەنها وازیان لێ بهێنرێت...ناتوانن ئەو خێراییە بەدەست بهێنن...ئەم مەسئەلەیەش بەکردەوە بەومانایە دێت تیرۆر بڕیاری

مردن کەسروشت بۆرەگەز یا تاکی ناشایستە...بەژیان مێژوو بۆ ئەو چینە ڕوو لەمردنە دیاریکردوە دەمودەست جێبەجێدەکات بێ ئەوەی بسرەوێت...تاپرۆسە لەسەر خۆ ناکارەکەی سروشت یامێژوو ئەو کارانە ئەنجام بدات.

لەحکومەتی تۆتالیتاری کاملدا کەگشت مرۆڤەکان بەتاك مرۆڤێك دەگۆڕێن..وەك ئەوەی تائێستا لەزۆربەی سیستمی سیاسی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دەیبینین..وئامانج لەهەمو کردەوە مرۆیەکاندا تاودانی جوڵەی سروشت یامێژوو بێت وهەر کارێك بەبێ ئاوارتەی لەلایەن مێژوویی سروشتەوە حوکمی لەسێدارەدانی بەسەردا بدرێت ولە بارودۆخێکدا بۆ ئەوەی سیمای بەردەوامی بەبزوتنەوە ببەخشرێت بتوانێت پەنا بۆ تیرۆر ببرێت،ئیدی پێویستی بە هیچ جۆرە پرەنسیپێکی کار نیە لەگەڵ جەوهەریدا جیاواز بێت.

لەم بەشەی تردا دێمەوە سەر بەعس..بەعس چیە،سیستەمی سیاسی و فیکری مەزهەبی و فەلسەفی چیە..؟بەعس دەرئەنجامی کی یە و ڕیشەکانی بۆچی دەگەڕێتەوە؟بۆچی دوای بەعسیش لە بەعس خراپتر هاتە کایەوە؟ ئەمە و چەندان پرسیاری تر لەم بەشەی تردا باس دەکەین...

# بەشی چوارەم

- ❖ مێژووی بەعس و کوشتارە گەورەکەی ئەنفال
  میشیل عەفلەق و فاشیەتناسی
- ❖ ڕۆحی فاشیزم و دروست بونی بەعس
- ❖ ئەنفال و کوشتارە گەورەکانی مۆدێرنە
- ❖ ماهیەتی فاشیزم
- ❖ تێڕامانی عەفلەق و بەعسیزم بۆ ناسیۆنالیزمی ڕۆژئاوایی
- ❖ بەعسیزم و دەوڵەتی بەعس
- ❖ ڕوانگەی ناسیۆنالیزمی بەعس بۆ ئیسلام

# مێژوی بەعس وکوشتارە گەورەکەی ئەنفال!!!

## میشل عەفلەق و فاشیەت ناسی

کـاتێ میـشل عەفلـەق بنـچینەی عەقیـدەی بەعـسی دادەنـا چوارچـێوەی بەعـسی عـەرەبی سوشیالـست،بەرەو دروسـت بـون دەچو،لەو سەردەمەدا نەك تەنها ناسـیۆنال سۆسیالیزم وفاشـیزم وەکو فۆرمی حکومەت سەرنج و ویـستی خـەڵکی ڕاکێشابو،بەڵکو تێـۆرەی ناسـیۆنالیزم بەتایبـەتی ناسـیۆنالیزمی فەرەنـسی و ئـەلمانی کـارێکی تایبـەتی کردبـوە سـەر زۆر پیـاوی سیاسـی و ڕۆشنبیر کە دەیانویست چاو بەسەر مێژودا بخشێننەوە تەماشای بکەن لەسەر بناغەی بیروڕا و نوسینەکانی تیۆرناسانی گیانی کۆی و توندوتیژی،بەم بۆنەوە دەبێ ئەوە بڵێین کـە مۆسـۆلینی بـەردی بناغەی فاشیزمی لەسەر بناغەی بیری سۆرێل و پێگوی وگـەردیلێ بەتایبـەت لەڕێگـەی عـەقلانی کردنـی تیـۆرەی دەوڵـەت بـەلای هێگڵەوە دانابو، ئەوەش زانراوە کە لە پـەرتیۆ و مۆسـکا و ڕێنـان بـەردی بناغـەی تێـڕوانینی ئەریـستۆکراسی و دژ بەدیمۆکراسـی و مۆسۆلینیان پێك دەهێنا.

مۆســــــۆلینی بەخۆشــــــحاڵیەوە بەجۆشەوە،پێــــــشنیازە ڕۆشنکەرەوەکانی پێش فاشیزمی ڕینانی بەرز دەنرخاند و بە زمانی ڕێنانەوە دەیگوت:_((عەقڵ وزانست بەرهەمی مرۆڤایەتین بەڵام ئەوە خەوێکە ئەگەر ڕاستەوخۆ داوابکرێت کە عەقڵ بۆمیلەت ولەمیلەتەوە سەرچاوە بگرێ دەترسم کە دوا وشەی ئەو دیمۆکراسیەتەی کەباسی لێ دەکرێ دۆخێکی کۆمەڵایەتی وا پێك بێنێ کە لەناویدا جەماوەرێکی نەخۆش بە بێ هیچ دوودڵیەك بەشوێن تێرکردنی حەزوئارەزوە چەپەکانی پیاوی نزمدا بگەڕێن.

لەوسەردەمەدا کە میشل عەفلەق ڕێگەی ژیانی سیاسی گرتبو بنەمای ئایدیۆلۆژی بەعس دادەنا و بەعس بەڕۆحی ئەم سەردەمەوە بوو کە بەرنامەی سیاسی وفەلسەفی وئایدیۆلۆژی دروست دەبو و خەباتی خۆی بەرەو پێشەوە دەبرد وبۆهاتنە سەر حوکم وە جێبە جێکردنی تیۆریەکانی دەوڵەت وە کۆمەڵگەی نەتەوەی.عەفلەق و سەرجەم ناسیۆنالستە عەرەبەکان هەر لە سامی شەوکەتەوە تا ساتع الحصری وە تا دەگاتە زەکی الارسوزی باوەشی بە ناسیۆنالیزمدا دەکات و ئاڵاکەی بەرز دەکاتەوە وەك تەنها گوزارشت بۆ ویستی کۆمەڵ ناوەڕۆکی ئەم ناسیۆنالیزمە وەرناگرێ لە واقیعی سۆسیۆلۆژی و کولتوری و مێژوی میلەتی عەرەب، چونکە وەك تێبینی دەکرێ گشت ئەو

ناوەڕۆکە زۆر نزیکترە لە دەربڕینەکانی ناسیۆنالیزمی ڕۆژئاوای ئەوەی کە ناسیۆناڵە سۆسیالیزم و فاشیزمی ئیتالی لەسالآنی نێوانی دووجەنگدا دەیانوت باوەڕیان پێ هەبوە لە پراکتیکدا خستیانەکار جگە لەوەی کە تا ئێستا هێلّیان بەژێردا.

بەلآم لێرەدا دەبێ بزانین فاشیزم چییە؟ ڕۆلّو ڕۆحی فاشیزم و ئاینی ئیسلامی عەرەب لە بونیاتنانی بەعس چییە؟بەعس و موتوربە کردنی ڕۆحی دادو وفاقی ئەم دوو تەورە چییە؟

## ڕۆحی فاشیزم و دروست بونی بەعس

ماهیەتی ڕاستەقینەی فاشیزم لە بنەڕەتدا دیاردەیەکی نوێیە لە پانتای سیاسەتدا و تەنیا زادەی سەدەی بیستەمە،یاخود هەر تاکرەوی کۆنە و بە شێوازگەلی کاراتر دەوڵەمەند بوە ، بۆ بەدەست هێنان و پاراستنی دەسەلآت لە سەروەختی دەسەلآت گرتنە دەستی مۆسۆلۆنیەوە سالّی١٩٢٢تاوەکو ئێستا مێژووناسان وکۆمەلّناسان و دەروونناسانی کۆمەلآیەتی توێژینەوەیەکی زۆریان بەئەنجام گەیاندوە بۆ وەلآمدانەوەی ئەم پرسیارە،هەرچۆنێك بێ تاوەکو ئێستاکە سەرکەوتن لەم بوارەدا سنوردار بووە،بەگشتی

گەیـــشتونەتە هاوڕاییـــەکی هەمـــەکی دەربـــارەی چـــیەتی و هۆکارەکانی پەیدابوونی فاشیزم لەم سەردەمە.

پانتـای سیاسـەتی ڕادیکاڵـەکان لـە موحافیزەکارەکـان جیـا دەکاتەوە هـەروەها لەویـژدانی ئـازاردراوی زۆرێـك لـە لیبراڵـەکانی ئەمرۆسۆراخ بکـرێن لەبـەردەم سەرزنـشتی لاوازی خۆیـان دەکـرد لەپێـشبینکردنی هاوکـاتی مەترسـی فاشـیزم ڕۆبەڕوبونـەوەی کارێگەر لەسەروەخت سەرهەڵدانی دا لەدەیەکانی بیست وسیدا.

ســەرکەوتنی فاشــیزم لــە ئیتالیــا وئــەلمانیا زۆرێــك لــە پێشبینیەکانی لیبراڵەکۆنـەکانی لـەباربرد کـە بەهـەمان ڕوانگـەی بـاوی دوادوای سـەدەی نـۆزدە دەیانڕوانییـە کۆمەڵگە،سروشـتی مرۆڤ ڕەوتی مێژووی وبەدلنیایەوە زۆرێك لە ئومێدەوە مەزنـەکانی ئەوانی باپیرەی شارستانیەتی خۆرئاوا نـەزۆکی کرد،وێـڕای هـەمو ئەمانە فاشیزم نەك هـەر لەناوچـەیەکی دواکـەوتوو گەشەسـەندوی جیهـان بـەڵکو لەپێـشکەوتوترین دوو وڵاتـی ئـەوروپای خۆرئـاوا سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو،پشکی ئیتاليا وئـەلمانیا لەشێوەی مۆدێرنی شارستانیەتی خۆرئاوادا ،پشکێکی جێگیربوە ئیتالیـا بـە بوژانەوەی ئەدەبی هونەری ڕێنیسانس و ئـەلمانیا بـە بزوتنـەوەی ڕیفورمی ئاینی.

نەریتە میللی وکولتوریکانی ئەوان سەرچاوەی دوو ئایدیال بە نرخی خۆرئاوا بوو....یەکێکیان ئازادی بیرو باوەڕی ئاینی وئەویتریان پلەوپایەی مرۆڤ،سەرەڕای ئەمە هەرچەندە پێشەڤە چونی ئەوان بەرەومۆدێرن بون بەسستی گەیشتوەتە ئەنجام ،لەدوادواکانی سەدەی نۆزدەدا هەموشتێك نیشانەی ئەوەبوو کە ئیتالیاو ئەلمانیا توانای ئەوەیان هەیە ببنە سیستمی کۆمەڵایەتی رۆشنگەر ...لەڕاستیدا لەسەرەتاکانی سەدەی بیستدا گوتارو رەخنە لیبرالیستەکان لە هەردوو وڵاتدا پێشوازی لێکرابوو پێدەچوو سەرەنجام هەریەك لەمانببێتە ئەندامێکی کامڵ ووەفاداری کۆمەڵگە نەتەوەکانی ئەوروپا...بەم شێوەیە لیبراڵەکان بە ناچار ڕووبەڕوی ئەم پرسیارە بوونەوە کە چی بوە هۆی پاشەکشەکردنی لە ناکاو چاوەڕوانکراوی ئیتالیا وئەلمانیا بەرەو بەربەریەت ،بەربەریەتێك کە بە بەکاربردنی توندوتیژی وکۆنترۆلکردنی ڕای گشتی بەسوودوەرگرتن لە پێشکەوتنە تەکنیکی وئابوری وزانستێکان پەرەی سەند، ئایە هیچ کەموکورتیەك هەبوو لە تایبەتمەندیە نەتەوییەکانی خودی ئەو خەڵکەدا ؟ئایە کیشەکە لە خودی چەمکی پێشکەوتندابوو؟یاخود جۆرێك گەندەڵی لەپرۆسەی لیبرالیزەکردن وە زەمینەی مۆدێرنی ئەمدا هەبوو.

کاتێـك کـە لیبراڵـەکان دەسـتیان کـرد بەگەڵاڵـەکردنی ئـەم پرسیارانە لەپێشدا دوو پرسیار سەریان هەڵدابوو کە جێگای ڕامان بـوون:لەلایەکـەوە ڕەخنـەگرانی مارکسیـستەکان پێیـان وابـوو کەفاشـیزم ئەنجامێکی،کۆنترۆڵنـەکراوی سیـستمی چـینێکی ناوەڕاستی ڕوولەنەمانە بەرامبەر لەدەستدانی بازاڕە کۆلۆنییـەکان لـەدەرەوەی وڵات وگوشـارە پەرەسـەندوەکانی پرۆلیتاریـای شۆڕشـگێڕ لـە نـاوەوەی وڵاتـدا (لیـنین)لـە نوسـینەکانی خۆیـدا دەربارەی ئیمپریالیسم بنـەمای ئـەم تیۆریـەوە ڕێبـازە فیکریـەی بنیات نابو پێویـست بـوو مارکسیەکان لـە دەیـەی بیـستو سـیو تەنیا وتەنیا دەبوایە تیۆرەکەی ئەو بەرفراوان بکـەن تـاوەکو ئـەم دەستەواژەیە(فاشیزم دواهەناسـەکانی سـەرمایەداریە)لـە گەڵیـدا بگونجێت ئەم دەستەواژەییە کە باشییەکەی لە سادەیەکەیدا بـوو زۆرێك لە ڕادیکاڵانەش ڕازی دەکرد کە لـە هەڵوێـستە بنـچینەکانی خۆیاندا بە مارکسیـست لەقەڵـەم نـەدەدران و تـا کۆتـایی جـەنگی جیهـانی دووهــەم، پەسـەند بـوبن تیۆریـەك بـو کـە دەربـارەی سەرهەڵدانی فاشیزم لە ئیتالی و ئەڵمانیا ڕاگەیەنرابو.

لە بەرامبـەر ئـەم شـەپۆلە سیاسیەدا بـەزوویی بۆچـونێکی تـر سەری هەڵدا ئەم بۆچـونە بیرۆکـەی ئـەو بیرمەنـد و هیومانیـست و نەریتپارێزانـە بـوو کـە پیـشەسازی زانـست عەقڵانیـەت و خـودی

دیمۆکراسییان لەچەمکی هەنوکەی خۆدا بە مەترسیەکی گەورە بو سەر شارستانیەت دەزانی ئەم بیرمەندانە بە پێشنیارکردنی کۆمەڵگەیەیکی ئایدیالی پیشەسازی باسیان لەو سەردەمانە دەکرد کە مرۆڤ پەیوەنیەکی نزیکی لەگەڵ سروشتدا هەبوە،ڕۆژگارێك کە پەیوەنییە کۆمەڵایەتیەکان سادە،ڕاستەوخۆ پابەند بون بە نەریتە کۆنەکانەوە چەمك گەلێکی گەلێ ئایدیالیستانەی وەکو شەرەف و شانازی،بەرپرسیاریەکی و ڕێزگرتنی بنچینەیانەی پلە وپایەی مرۆڤ بە سەرچاوەی ژیانی کۆمەڵایەتی دەژمێردران،ئەوان باوەڕیان وابو کە پیشەسازی بوونی خێرا بوەتە هۆی زیادبوونی دانیشتوان،شارنشینی گۆڕانی مرۆڤەکان بە کۆمەڵەی هاوشێوە و فراوانبوی شێوازی نوێی تەبلیغاتی قەناعەتپێکردن بۆ ووروژاندنی کۆمەڵەکان وە دواکەوتنی هەمو ئەو بەها کولتوریانەی کە لە سەردەمی ڕێنیسانسەوە شارستانیەتی خۆرئاوایان بە هەنگاوی لێبراوانە بەرەو پێشکەوتن و ڕۆشنگەری دەبرد.

بەو پێە ئەوان باوەڕیان وابو کە فاشیزم نیشانەی سەرکەوتنی بەربەرەکانی دانیشتووی ناو شارە جەماوەری و مێگەل ئاساکانە بەسەر ئە ڕۆناکبیرە دەستەبژێر هێومانستیانەی کەلە سەرەتای شارستانیەوە حوکمڕانییان کردون لە هەمو سەرنج ڕاکێشتر و

کورتتر،ئەمەیــە کــە تێگەیــشتنی هێومانــستی نــەریتپارێزان و مارکــسیەکان لــە فاشــیزم لــە خاڵێکــدا یەکدەگرێتــەوە هــەردوو لایەنەکــە پێیــان وابــوو کــە فاشــیزم وەکــو پێویــست ئــەنجامی عەقلانیەت ماتریالیزم نەبونی هەستیارێتی و بێئاگایی کۆمــەڵگای ســەرمایەداریە لــە خــەڵك ، نــاکۆکی نێــوان تــەعبیری مارکسی بــۆ فاشــیزم و دیــدگای نــەریتپارێزانی هێومانیــست لــەم بارەیــەوە پەیوەنــدی هــەبوو بــە دەرهاوێشتەکانی فاشــیزم بــۆ ئایـنـدە ئــەو هەستەی کە ئاکامی ووردبونەوە لە دوارۆژێکــی وایــە...لــە کاتێکا کە مارکسیەکان باوەڕیان وابوو کە فەلسەفەی مارکسیستی مێــژوو لایەنگیری فاشیزم دەکات،نــەریتپارێزانی هێومانیــست فاشــیزمیان بە ڕەدکرنەوەی خودی مێژو دەزانی و لەکاتێکا کە گروپــی یەکــەم ســەرهەڵدانی فاشــیزمیان بــە پێــشەکیەك دادەنــا بــۆ دەســتپێکی سەردەمێکی ئازاد و ڕۆناکتر واتا سەردەمی کۆمۆنیزم...

گروپــی دووهــەم بــە ســەرەتای هــەرەس هێنــانی خــودی شارستانیەت لە قەڵەم دەدا لەم دوایانەدا بیرمەندان هــەوڵیان داوە بنــەماکانی هەڵوێستێکی نــاوەنجی لــە نێــوان ئــەم دوو هەڵوێستە ڕادیکاڵەدا سۆراخ بکەن.

ئایا وەڵامی سەرکەوتنەکانی فاشیزم لە ڕۆژگاری خۆیدا چییە؟

هـيچ جـۆره ڕۆنكردنەوەيـەكى يـەكگرتو وسـادە لـە ئـارادا نييە،بەلآم ئەگەر بمانەوێت ڕونكردنەوەيـەكى بـۆ بدۆزينـەوە تاكـە ڕێگـا شـيكردنەوەى ئـەم پرسـەيە كـە فاشـيزم لـە كۆمەڵـە جۆربەجۆرەكاندا چۆن ڕەفتار دەكات وە نابێت تەواوى هەوڵـەكان بخەينەكار كە بزانين لايەنگران و نەيارانى فاشيزم چى دەڵێن لـەو بارەيەوە ؟

مەبەست ئەوەيە كە وايس پـێ وايـە بۆناسـينى فاشـيزم دەبـێ سـەروى تێبـينى پەيوەنديـدار بـە نـاوەڕۆكى ئايـديۆلۆژى دەسـت بكەين بە خوێندنەوەى كۆمەلآيەتى..سياسى و ئابورى تايبـەت بـە پێكهاتەى ئەو ئايديۆلۆژييە ماوەيەك لەمەوبەر بـە خـەڵكيان وتـوە كـە نـازيزم دياردەيـەكى تايبەتـە بـە ئـەلمانيا و نمايـشى نـامۆى بەربەريەتى  خۆى كارەكتەرى ميلەتى ئەلمانيا و ئاكامى سروشتى سـەربەخۆى سياسـى ئـەم خەڵكەيـە..تێڕوانينێكـى وەهـا گەشەسەندنى فاشيزم ئەم ڕاستيە پشت گوێ دەخات كە فاشـيزم لـە ولآتـانى تـريش سـەرى هەڵـداوە ئـەو هەلومەرجـەى بـوە هـۆى هاتنەكايەى فاشـيزم لـە ئيتاليـا وئـەڵمانيا وفەرەنـسا بـەريتانيا و تەنانەت ئەمريكاش لە ئارادا بـوە(وە ئێـستاش هەيـە)بـە بۆچـونى وايـس:ئەگـەر بڕيـار بێـت فاشـيزم وەكـو دياردەيـەكى مێـژوى لـە بەرچاو بگرين،واتە وەكو هاتنە ئارا بزاڤێكى سياسى لـە ئيتاليـا و

ئـەڵمانیای سـەدەی بیـستەمدا ڕەگـی داوەتـەوە بـەڵام بـەر لـە سـەرهەڵدان و سـەرکەوتنی هـیچ بەڵگەیـەکی باوەڕهێنـەر لـە بەردەستدا نەبوە بەم شێوەش دەبێت ڕەوتـی پەیدابوونی لـەناو هەلومەرجێکـەوە سـۆراخ بکـەین کـە پەیتاپـەیتا لـە ئـەوروپای خۆرئاوا لە سەردەمی شۆڕشی گەورەی فەرەنساوە هاتە ئاراوە.

ئەو وێڕای لایەنگری لەم بۆچونە متمانە پێکراوانە سەبارەت بە فاشیزم خراوەنەتە ڕوو،ناوەڕۆکە ئایدیۆلۆژێکی تاوتوێ دەکات وە ئەم خاڵانەی خوارەوە وەکو کۆمەڵە بیرۆکە و ئایدیالێك ناو دەبات کە فاشیزم بەشێوەیەکی ئاشنا سودیان لێ وەردەگرێت.

_تێـڕوانینی ئۆرگانیـستی لـە کۆمـەڵ..ئایـدیالیزمی فەلسەفی،ئایدیالیزمی باشیەکانی پیـاوان زیـاتر بەشـێوە دێهـاتی یـاخود جوتیارێکـەی هـەروەها دوژمنایـەتی لەگـەڵ سـەرمایەداری پێـشکەوت هاوەبـەش یـاخود مۆنۆپـۆلی...دوورکەوتنـەوە لـە دیمۆکراسـی پەیوەسـت بـە بـیروڕای کۆمـەلانی خـەڵك..تێـڕوانینی دەستەبژێرانە یاخود لە ڕێبەرایەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی،ئـەمجار ڕەگەزپەرسـتی و دژایـەتی کردنـی جولەکـە نـەك وەك پێویست..هەشتەم عەسکەرتاریەت و ئیمپریالیزم.

بە بۆچونی ئەو لە هـەموو ئەوشـتانەی کـە لەسـەرەوە باسـکرا خـاڵێکی هاوبـەش هەیـە و ئـەویش دژایـەتیکردنی بـەها وبنـەما

لیبراڵیەکانە.کاتێ هەمو ئەمانە لە بزاڤێکی فاشستیدا ڕەنگ دەدەنەوە کە ئەم بزاڤە هاوکات پشتگری کۆمەڵان و بڕیاری بەکاربردنی توندوتیژی و شێوازە پێشکەوتوەکانی کۆنترۆڵی بیرورای گشتی،دەستەبەرکات بۆبەدیهێنانی پشتگیریەکی وەها،ئەو سوورە لەسەر ئەوەی کە فاشیستەکان دوابەدوای گەیشتن بە دەسەلات لە ڕوی چۆنایەتیەوە بەشێوەیەکی جیاواز لە پێشینانی سەدەی نۆزدەی خۆیان دەردەکەون...بەلام ئەم جیاوازییە چۆنایەتیە تەنیا لە سودوەرگرتن شێوازە ڕادیکاڵەکانی گەیشتن بە ئامانجدایە نەك لە خودی ئامانجەکاندا..ئەم ڕادیکالیزمەی ئەوانیش دواجار لەدیدی نەریت پارێزانەوە شێوەی پاساودانەوە،چونکە ئەوان خۆیان لەبەرامبەر هەڕەشەی لیبرالیزم و سوسیالیزمدا دەبینەوە کەزیاتر هاوکاتە لەگەڵ پێشوازیبونی بەمۆدێرن بونی سیستەمە کۆمەلایەتیکان بەمشێوەیە وایس ئەم بۆچونە ڕەددەکاتەوەکە دەڵێن فاشیزم((ئاژاوەی نەیارانی ئەقڵە بەرامبەر زانست و تەکنەلۆجیا لەڕوانگەی ئەو نەریتپارێزانەی کەوتونەتە ژێرگوشاری ئایدیۆلۆژای چەپ و فاشیزم ڕێکەچارەیەکی تەواو لۆژیکییە بۆ ئەو کێشانەی ڕوبەڕویان بوەتەوە بەکورتی لەو سیستەمە کۆمەلایەتیانەدا کە بەخێرایی روولە پیشەسازیبون شارنشینی و دیمۆکراتیزەبوونی

سیستەمەکۆمەڵایەتیەکانن، ڕەنگە ئەو نەریتپارێزانەی ڕەگ وڕیشەیان لە سیستەمی کۆمەڵایەتیدا داکوتاوە بەپێی توانایان پەناببنە بەر شێوازە فاشستێکان و بەکاربردنی توندوتیژی کۆنترۆڵکردنی بیروڕا تۆقاندن یا تەنانەت کۆمەڵکوژی بۆ ڕزگارکردنی شێوازی ژیان وئیمتیازات و بەهاکانی چینایەتی خۆیان.

وایس بە لێکۆڵینەوەی لەسەر ژیانی فاشیزم لە وڵاتە جیاجیاکان دەریدەخات کە فاشیزم هەڵاوێردێکی حەتمی نییە لە وتووێژەکەیدا دەربارەی دەسەڵات گرتنە دەستی فاشیزم لەئیتالیا و ئەڵمانیا دەریدەخات کە ئەم مەسئەلەیە لەڕاستیدا قورخکردنی دەسەڵات نییە لەلایەن فاشیستەکانەوە، زیاتر ئاکامی ڕێکەوتنە جۆراوجۆرەکانی ناو باڵی سیاسی ڕاست و ڕێکەوتنی نێوان باڵی ڕاست و ئەو گروپانە بوە لەگەڵ سەرکەوتنی لیبرالیزم سۆسیالیزم پتر لە هەموو شتێك بەرژەوەندێکانی خۆیان لە دەست دەدات واتە وردەپیشەسازی بازرگانەکانی ئەریستۆکراتە موفلیسەکان و هتد...

بەبۆچوونی ئەو کۆمەڵگایانە کە ڕەوتی وەرچەرخانیان دەستپێکردوە بەرەو سیستەمی کۆمەڵایەتی مۆدێرن،زیاتر دەکەونە بەر هەڕەشەی فاشیزم ئیتالیا و ئەڵمانیا بەو پێ یەی کە

ڕێگـەی پیـشەسازیبون لیبرالّکردنیـان گرتبوەبـەر کەوتنـە بـەر پرۆسـەی بەجەمـسەر بـوونی چـینایەتی کـە مـەرجی پێویـستی پێـشەکردنی فاشـیزم،لە هــەردوو وڵاتــدا بزافــی لیبراڵــی و سوشیالستی بەهێز هەبون نەریتپارێزان بەدروستی گەشەی هێـزە چەپەکانیان بە هەڕەشەیەك دەزانی لەبەردەم مانـەوەی خۆیانـدا، ئەم مەسئەلەیە دنەی ئەوانی دەدا تاوەکو لەحاڵەتی شکستهێنانی ڕێگەچـارەکانی تـر(ڕێگەچـارەی یەکلایەنـەی فاشـیزم بگرنەبـەر سـەرەڕای ئـەم کـەش وهەوایـە بـەدوای گرتنـە دەسـتی جڵـەوی دەسەڵات لە ئیتالیـا و ئـەڵمانیا فاشـیزم نـەریتپارێزانی پـشتیوانی خـۆی سـەرکوت کـردوە ئـەو بەڵێنانـەی نەبردەسـەر کـە دابـوی بەکۆمەڵ هەوادارەکانی بۆ خۆشـگوزەرانی کۆمەڵایـەتی و ئەمـەش ئـەنجامێك بـوو کـە هـەم بـۆ دەسـتەبژێران نـەریتپارێز و هـەم بـە کۆمــەڵانی سەرلێــشێواوی دەنگــدرە شــیاوی پێــشبینیکردنی نەبوو،هێتلەر بەر لەهەر شتێك هـەموو ئـەو ئیمکاناتـەی قـورخکرد کـە کەرەسـتەی مـۆدێرنی پەیوەنـدکردنی گەشـت وگواسـتنەوە وگەیانــدن و دەزگــای پــۆلیس دەیــانتوانی بیخەنــە بەردەســت کـۆنترۆلی تـەواوی سیـستەمی کۆمەڵایـەتی بکـەن ، وایـس ئـەم ڕەهەندەی کۆنترۆلنەکراوی فاشیزم لەشیکردنەوەکەی خۆی لەمەڕ کارنامەی ڕاستی ڕادیکاڵ لە عەرشـی دەسـەڵاتدا دەخاتـەڕوو ئـەم

باسه دەهێنێته پێشەوه کە نازیزم له کرداردا دەریدەخات کە ئایدیۆلۆژیایەکی تەواو نەریتپارێزانە نییە بەڵکو هێرشێکی بەردەوامە بۆسەر شارستانییەت و لەهەموو شێوەکانیدا لەوانە لیبراڵ نەریتپارێز وڕادیکاڵ بەگوێرەی شیکردنەوەی وایس دەربارەی فاشیزمی ئینگلیزی و ئیسپانیاو پۆلۆنیاو ،فاشیزمی هیتلەر هەلاوێردێکی حەتمی نیە،بۆئەوچینە نەریتپارێزانەی گیرۆدەی هەڕەشەی چەپن وە بەشێوەیەکی ناڕۆشن ڕایدەگەیەنێت کەچارە نوسی بزاڤە فاشستێکان لەم وڵاتانەدا تێزەکەی ئەو بەشێوەیەکی نێگەتیڤ دەسەلمێنێت چونکە هاوکێشەی دەسەڵاتی فاشستەکان وە پانتای پلانە ڕادیکاڵەکانیان جیاوازبوو ئەم جیاوازییە پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی بە ئاستی هەڕەشەی لیبراڵیزم وسوسیالیزمەوە هەبوە ، لەشوێنێکی وەکو بەریتانیا کە دەزگاکان لە ڕێسای دەسەڵات مابوەوە وە لەجیگایەکی وەکو ئیسپانیادا کە نەریتپارێزەکان بە هێزتربون، بەڵام گروپ گەلێکی ڕەسەنی لیبراڵ وەسوسیالستەکان لەئۆپۆزسیۆندا هەبون،کاردانەوەی نەریتپارێزەکان توندتربوو،بەڵام دوایی ئەوەی کە لیبراڵەکان سوشیالستەکان تێشکان شیوازە فاشستێکان گیرانەبەر نەك بەوشێوە کاولکاریەکی کە لەئەلمانیا تاقیکرایەوە بەڵکو زیاتر

بۆپـشتیوانی لەسیـستمی نـەریتپارێزی کـۆن گیرانەبـەر دواجـار لەهـــەنگاریا سوسیالـــستەکان لاوازو ســـەرکەوتنیان کـــاتی بوو،کاردانـــەوەی نـەریتپارێزان لەگرتنەبـــەری رێگــەی فاشـستی خۆیان بەهەمان ڕادە هێمنتربوو،ئەوئەنجامە کێشەی کـەدەتوانین بەدەستی بێنین ئەمەیە،کەهـەر چـەندە فاشیزم بەرهـەمی هێـزە جیهانیـــەکان بـــوو لەســـەردەمی وەرچـــەرخانی سیـــستمە کۆمەلآیـــەتێکان لەکـــشتوکاڵەوە بۆپیـــشەسازی وەکوپیویـــست بەئـــەنجامی ڕەوەنـــدێکی نەتـــەوەیی،یان قۆنـــاغێکی حـــەتمی قۆناغـــەکانی پەرەســـەندنی دیموکراســـیە لیبراڵـــەکان لەقـــەلآم نەدەدرا،هەرچـەند هێشتا لەهـەر کۆمەڵگایـەکی قوربـانی ڕەوەنـد گەلێکی وەها وەکـو شیمانەیەکی ئاشـکرا خراوەتـە بـەرباس.ئـەم ئەنجامگیرییـــە زەمینـــەی کۆبەنـــدی دیدوبۆچـــونەکانی وایـــس پێکدەهێنێت بـەدەربرینێکی تـر وایـس بـاوەڕی وایـە کەئاینـدەی فاشیزم ئەگەر ئایندەیەکی هەبێت لەولآتانی دواکەوتوو بەلآم نـوێ جیهانـدا دەبێـت وەکـو ڕۆدیزیـا...زیمبـا بـۆی ئـەمرۆ..ئـەفریقای باشوور..لەسەردەمی ئەپارتایدا زۆرێك لـەولآتانی ئـەمریکای لاتـین بۆئـەوەی کـە بتـوانن لـەدونیای مـۆدێرنی ئـەمرۆدا بـژین،دەبێت پیـــشەسازی بکـرێن وەبەهـــەر شـێوەیەك کـــە بکرێنـــە ولآتـــی پیشەسازی هەلومەرجێك دەهێننـە ئـاراوە کـە بەهۆیانـەوە بزافـی

لیبراڵی یاخود سوسیالستی سەرهەلدەدەن،ئەم بزاڤانەش ناچار گروپ وچینە جێگیربوەکان دەخەنە بەرهەڕەشەو بەم شیوەیە ئەوان ملکەچی نیگەرانیەك دەکەن کەبەهۆیەوە ڕودەکەنەبیرۆکەی بەکاربردنی پلانە فاشستێکان، بۆ سود وەرگرتنی هاوکات لەتایبەتمەندی سیستمی نویَ سودەکانی سیستمی مۆدێرن بە کورتی لەدەرەوەی جیهانی خورئاوادا خەتەری بیَ هۆکار نەك لەلایەن تۆتالیتاریزمی چەپ بگرە لەلایەن تۆتالیتاریزمی ڕاستەوە سەرچاوە دەگرێت.

بە بۆچونی وایس ئەو خۆرئاواییانەی کە بەباشی دەزانن چۆن فاشیزم دێتە ئاراوە لە ناکۆکی نێوان گروپە نەریتپارێز وجێگیربوەکان و داواڕاستەکانی ئەو گروپە نوێیانەی لەپرۆسەی پیشەسازیبونەوە سەریانهەڵداوە ئەو توانایە دەبێت کە یارمەتی کەسانێك بدەن کە سۆراغی ڕێگەیەکی میانڕەو دەکەن لەنێوان تۆتالیتاریزمی ڕاست و چەپەوە لەم ڕوەوە توێژینەوەکانی ئەو ئێمە بەرەو ئەو جێگایە دەبات کە هەر بەرهەمێکی مێژووی پێویستە بمانبات کێشە هەنوکەیەکان و ئەرکەکانی ئێمە ڕۆشنبکاتەوە.

بەر لەوەی بچینە سەر ماهیەتی فاشیزم کەمێك لەسەر ئەم تەوەرەش ڕادەوەستم ئەنفال و کوشتارە گەورەکانی مۆدێرنەش

ئاشكرا دەكەین كە كارەكتەری مۆدێرنە لەسەر جینۆسایدی كورد تا چی ئەندازەیەك ئاسانكاری بۆ ئەو پرۆسەیە كردوە.

## ئەنفال و كوشتارە گەورەكانی مۆدێرنە

مۆدێرنە ئەو ماشێنە گەورەیە كە پرۆسەی جینۆسایدی پێ بەرجەستە دەكرێت،وە لەزۆر ڕوەوە ئاراستەی دەكات،وەك هەندەسەیەكی كۆمەلایەتی دەیسەپێنێت...جینۆساید ئەو تەوەرە ترسناكەیە كە مۆدێرنە دروستی دەكات_مەبەست لەو تەوەرەش دەولەتە.

دەولەتی نوێ هەلگری ئەو مەرج و پێداویستیە مادی وسیاسی و كولتور و ئەخلاقییەیە كە وایی لێ دەكات بەئاسانی بونی هەموو ئەو هێز وگروپ و تاكانە وێران دەكات،لەگەل ئەو وێنانەدا یەك ناگرێتەوە كەدەولەت بۆ كۆمەلگای هەیە...دەولەتی مۆدێرنە دەتوانێت بونی هەموو ئەوانە بخاتە مەترسیەوە كە نایەوێت لەناو پلانەكانی ئەو هەندەسە كۆمەلایەتیە جێگیربن كە دەولەت بۆ كۆمەلگای ئەكێشێ..ئەو هەندەسە كۆمەلایەتییە لەفۆرمە پەرگر و توندڕەوەكەیدا فۆرمێكە كەلە ئێراقدا خوازیاری ئەوەیە هەموو هێزێكی كۆمەلایەتی هەموو گروپێكی ئەتنی و كولتوری ئایینی واز

له شوناس و پایەکانی دەسەڵاتی خۆیان بهێنن،ئەو شوناسە داسەپاوە قبول بکەن کە دەوڵەت لەسەرەوە بەسەریاندا دەیسەپێنێ...ئەم هەندەسەیە تواندنەوەی جیاوازییەکانە لە پرۆسەی دروستکردنی وێکچونێکی سەرتاسەریدا ، لێرەوە دەوڵەتی مۆدێرن ماشێنی هەڕەشەیەکی بەردەوام وتوندتر دەبێت،لە بوونی هەر گروپ وتاکێك کە فەنتازیاکانی دەوڵەت و وێناکردنە سیاسی وکۆمەڵایەتی وئەخلاقی وکولتوریەکانی چ بۆخودی دەوڵەت وچ بۆکۆمەڵگە قبولێ ناکات بەتایبەتی ئەو دەوڵەتانەی لە دەرەوەی هەر پەیمانێکی کۆمەڵایەتی هەر میکانیزمێکی چاودێریکردنی حوکمکردن یان هەر پرۆژەیەکی سیاسی وکۆمەڵایەتی هەر دابەشکردنێکی دەسەڵات کاردەکەن ، دەوڵەتێك لەفیکری سیاسی نوێدا بە دەوڵەتی هۆبز ناونوسکراوە لەسەرەوەڕا وێنە وهەندەسەیەکی کۆمەڵایەتی وسیاسی تایبەت بەسەر کۆمەڵگادا دەسەپێنێتو لەسەرەوەڕا بڕیار دەدات کۆمەڵگا چ فۆرم وچ شێوەیەك ئاراستەیەکی گەشە کردن وەربگرێت قوربانێکان بەدرێژای مرۆڤایەتی بە بوونەوەرێکی بێ شوناس ناسراون.تەنانەت لەخودی دەوڵەتی مۆدێرنەشدا ئەوە هەر ڕوی لایەکی تاریکی مۆدێرنەیە،وادەکات بە ئاسانترین شێوە لە کوشتارێکی گەورەدا ئەو هەموو ئینسانە فەرامۆشبکرێ قڕبکری

وه دوادوای ساڵانێکی زۆر ئاسەواریان بیرچێتەوە قوربانی نە پێویست دەکات کەسایەتی خۆی بناسێت و نەکەسیش داوای خۆناساندنی لێ دەکات خۆناسادنیش مانای داننانە بە بونێك بەتاکێك کە خاوەنی کەسێتی بێت.

لەناو دەوڵەتی مۆدێرنەشدا تاکە کەسێك کەقوربانی و جەلاد لەیەك خاڵدا کۆدەکاتەوە نەبونی بڕیارە بۆ ژیان وژیان بەخشین، نە قوربانی دەتوانێت داوایی ژیان لەجەلادەکەی بکات نە جەلادیش دەتوانێ ژیان ببەخشێتە قوربانێکەی ، حوکمی کۆمەڵکوژ بڕیارێکە لەدەرەوەی ویستی قوربانی و جەلادیشدایە چونکە نەقوربانی دەزانێت بۆ دەکوژرێت ونە جەلادیش دەزانێت بۆ دەکوژێت،کردەی کۆمەڵکوژی سیفەتی مانا لە هەردوولا وەردەگرێتەوە بەهای عەقڵ ئینسان....ژیان ومردنیش دەسڕێتەوە لە ساتەوەختی ملهوڕی هەمەجێیەتدا جەلاد تەسلیمی بڕیارێکی نا عادیلانە دەبێتەوە بڕیارێك ئەگەر وانەکات دەکرێ لەساتێکدا کۆتایی بەهەموو پرسیار وولامەکانی ژیان بهێنێت، لێرەوە زەمانی جەلاد زەمانی کوشتنی هەموو کایەکانە....کۆمەڵکوژی داخستنی دەرگای هەموو بیرکردنەوەیە،خۆفڕێدانە ناو ڕەهەندەکانی مردن کە تاریکترین و نادیارترین چرکەساتی مرۆڤە وهەموو جیاوازییەك دەسڕێتەوە

کەسی قوربانی دەشێت بەهەمان زمانی جەلادەکەی بدوێت یان باشتریش قسە بکات و هەمان ئایینی هەبێت بەڵام قوربانیکراو لە بەردەم پرسیاردا نییە چونکە پرسیاری بۆ پرسیارێکی عەقڵانیە و چاوەڕوانی وەڵام دەکات چاوەڕێی گفتوگۆردەکات....پرسیاریش تەنها کەسی ئازاد دەتوانێت بیکات،تەنها ئازادی خوازیش دەتوانێت وەڵامی بداتەوە،کوشتنی عەقلّ لەڕێگەی کوشتنی هەموو پرسیارەکان وئازادی جەستە سەرهەڵدانی زەمەنێکی شومە زەمەنی تۆتالیتاریەکان وە هیچ مەودایەك بۆ شوێنی مرۆڤ و وابەستەیی خۆیەوە نامێنێ شوێنێکیش ببێ بە مەزاری حەیوانەکان فاشیزم ئیدی شوێن زەمەنیش هیچ نادات بەدەستەوە.تەنها زەمەنی قڕکردنی مرۆڤ نەبێت.

ئەنفال تەنها وێرانکردنی جێگایەك نییە...بەر لەهەر شتێك ئەنفال بۆ خۆی سیستەمی زمانێکە کاردەکات دابەش دەبێت بەسەر چەند شێوە بیرکردنەوەیەکی جەهەنمیانە ئەوەی مرۆڤە عەقڵە دەیکوژێت.

ئەنفال تەنها هەڕەشەیەك نییە دژی ژێرخانی ئابوری کروپێك یان نەتەوەیەك،ئەنفال هێرشێکی ڕاستەوخۆی شەڕە دژی هەموو کایەکانی ژیان،وەکو گشتێکی دابەشکراو،بۆ سەر بونی مادی و مەعنەوی خەڵکانێك تائاستی فەناکردنی یەکجارەکیان.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش:بۆ جەنگ بەردەوام لە عێراقدا بەرهەمی پێکهاتەی دەسەڵات و پێکهاتەی دەوڵەت و پێکهاتەی کۆمەڵگەی عێراقە؟ئەنفال لێردا ئەوەمان بۆ لێکدەداتەوە بۆ جەنگ دەرئەنجامێکی لۆژیکی ئەو هەندەسە کۆمەڵایەتیە؟.

لێرەدا بۆ سود وەرگرتن لە سەرچاوەکان دەگەڕینەوە سەر چەمکی دەسەڵاتی جینۆساید داخۆ ئەم دەسەڵاتە چیە؟کامەیە وچۆن دروست بوە؟

لێرەدا فۆکۆ ئەم سێ شێوە دەسەڵاتە لە یەکدی جیادەکاتەوە کە ئەمانەی خوارەوەن:-

١-دەسەڵاتێك لەسەر فیوداڵی کاردەکات ڕاستەوخۆ دەرئەنجامەکەیەتی . بە بۆچونی فۆکۆ ئەم شێوە دەسەڵاتە بریتیە لە دەسەڵاتی بەر لە پرۆسەی مۆدێرنیزمەوە هاتنە کایەی دونیای مۆدێرنە...مەبەست وئامانجی سەرەکی ئەم دەسەڵاتە بریتیە لە پاراستنی پاشا وئەمیر پاشاش بۆ پاراستنی ئەو سەروەرییە مافی کوشتنی هەموو کەسێکی هەیە..وەکو ئەوەی لە ئەزمونی سەرۆکایەتی عێراق بینیمان و تیایدا بوینە قوربانی.

پادشا وئەمیرەکانیش پەیوەندییەکی ئۆرگانیك لەگەڵ دەسەڵاتدا هەیە ناتوانن دەستبەرداری بن،لێرەشدا کۆمەڵگا وچەمکی هاوڵاتی ئامادە نین چونکە هەم سیستەمی دەسەڵات

وهەم سیستەمی سیاسی لە بیرۆکەی پاشا وسەروەری بنیاتنراوە ئەوەی لێرەدا پێویستە بوترێت مافی کوشتنە لەلایەن سەرۆك یان پاشاوە،دەسەلاتیش بۆ پاراستنی ئەو قەوارەی دەسەلاتە سزادەدات.

٢-شێوەی دەسەلاتەکە بریتیە لەو دەسەلاتەی کە لەسەر بایەلۆژی ئینسان وخودی ژیان لە مانا بایەلۆژی وسیاسیەکەیدا کاردەکات،لەلای فۆکۆ ئەم دەسەلاتە بەرهەمی ڕۆژگاری مۆدێرنەو لەوکاتەدا دروست دەبێت کە دەوڵەت بیر لە کۆمەڵگا دەکاتەوە وەك گشتێکی سەرتاسەری.

٣-شێوەی سێهەم لای فۆکۆ دەسەلات بریتیە لە دەسەلاتی کۆنترۆڵکەر ئەمەش دیسانەوە بەرهەمی ڕۆژگاری مۆدێرنەیە وپرۆژەی مۆدێرنەیە...سیستەمی چاودێری ستراتیژی سەرەکی ئەم شێوە دەسەلاتەیە،چونکە لەڕۆژگاری بەرلە مۆدێرنە پادشا نەیدەتوانی تەواوی خەڵکی بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە...پادشا دەستگای مۆدێرنەی نەبوو،زانیاریش نەبوو تا کۆمەڵگا شیبکاتەوە...پرۆسەی مۆدێرنیزم دەیەوێ دامودەزگای کۆنترۆڵکەری هێنایە کایەوە لە لەشکری مۆدێرنەوە تا کارخانە وبەندیخانە،وقوتابخانە وپارتی سیاسی وسەرەڕای هەموو ئەمانەش لەدایکبوونی زانستەکانی سۆسیۆلۆژیا وسایکۆلۆژیا

وزانستی سیاسەت وبایەلۆژیا لای فۆکۆ دەسەلآتی کۆنترۆڵکەر جورێك ئینسان بەرهەمدێنێت کە ناوی ناوئینسانی ڕامکراو بەندکراو لەناو چوارچێوەی مۆدێرنەدا.

بەلای فۆکۆوە سیاسەتی کوشتن ولەناوبردنی جینۆسایدیانەی ئینسانەکان مانای گەڕانەوەی دەسەلآتی سزاگەر نییە بۆ ناو هەناوی مۆدێرنە....کوشتن لەدونیای نازیەکاندا لەو مافەکۆبوەتەوەو هاتوە کەپادشا هەیبو بۆ لەناوبردنی ئەوانەی سەروەری پادشایان دەخستە مەترسیەوە..بەڵکو کوشتنی بەکۆمەڵ لەو ڕاستیەوە دێت کە دەسەلاتی مۆدێرن بەهەمان ئەندازەی ئیشکردنی لەسەر ژیان دەتوانێت لەسەر مەرگیش دەستەبەر بکات،کوشتنی بەکۆمەڵ لەڕۆژگاری مۆدێرنەدا پاراستنی سەروەری پادشا نییە بەڵکە لەبەر ئەنجام فەنتازیاکردنی دیاریکراوی شوناسی کۆمەڵگا مۆدێرنەکانە وەکو بونێکی هاوشێوە ویەکچو.

بەکورتی ئەنفال هەم بەرهەمی گەشەی تەکنەلۆژیای مۆدێرن وهەم بەرهەمی کولتوری سیاسی مۆدێرنە وهەم بەرهەمی ژووره مۆدێرنەکانی کاغەزی کوشتنە وهەم بەرهەمی ئایدیۆلۆژیای ناسیۆنالیزمە،ئەنفالی کوردیش بەهەمان پێودانگەکانی

هۆلۆکۆست بەرهەمی مۆدێرنە وترادسیۆنی ئایینی وبیری شۆفێنیزمی عەرەبی بوو لەدوادوایەکانی سەدەی بیستەمدا.

## ماهیەتی فاشیزم

شتێکی نامۆیە ئەگەر مرۆڤ لەکۆمەڵەیەکدا کە بەناساندنی نەریتە گەورەکانی مێژوی شارستانیەتی جیهانە خەریکە،ڕوبەڕوی لێکۆڵینەوەیەك بێتەوە کە دیاردە نویێ شۆڕشگێڕەکانی وەکو فاشیزم وناسیۆنالیزم تیایدا تاوتوێ کراون،چونکە ئەم دیاردەیە لەڕواڵەتدا،ڕەگێکی مێژوییان نییە...خەڵکی ئاسایی هێشتا لە ئۆردوگاکانی مەرگ وکوشتاری ئەنقەستی ملیۆنان مرۆڤی بێگوناه واقیان وڕماوە،بەناچار فاشیزم ونازیزم بەو زیادەیە ترسناك وبێهاوتا،نەخوازراو وێنادەکەن کە سەربە وەچەیەکی تایبەت ودابڕاون زۆرجاریش زانایان تۆتالیتاریزمی مۆسۆلینی وهیتلەر بە کاردانەوەگەلێکی ئاوارتەیی وتێپەڕ لەقەڵەم دەدەن بەرانبەر بشێوییە کۆمەڵایەتیە توندەکانی سالآنی نێوان دووجەنگی جیهانی گەورە ، ڕەنگە زۆرجار وێنا بکرێت کە ڕاستڕەوی ڕادیکاڵ تاکە دەرهاوێشتەی ئەو نەریتە ئەڵمانیە تایبەتەیە کە دورن لەڕێساکانی

پەرەسەندنی مێژوی ئەورووپای خۆرئاوا چونکە سەرنجی زانایان وگشت خەڵك لەسەر نازییەکان بووە.

بەڵام بەبۆچونی من یەکجار جەختکراوە لەسەر چییەتی رەسەن وهاوچەرخی فاشیزم لێکجیاکردنەوەیان ئەگەر مەبەستێکی کەسێك لە زاراوەی نەریتی فاشیزم بوونی کاردانەوەیەك فاشستی دریژخایەن و بەردەوام بێت لەلایەن گروپە بەهێز ورەگ داکوتاوەکان لە کۆمەڵگادا بەرانبەر گۆڕانە کۆمەڵایەتێکان،ئەوە دەبێت بگوترێت نەریتێکی وەها بوونی نەبووە لێرەدا مۆسۆلینی نمونەیەکی گونجاوە کە دەڵێت:

من کۆنەپەرەست وشۆڕشگێڕم بە شێوەیەکی گشتی بزافی فاشیزم هەرچەندە ڕادیکاڵە دیسان بزافێکی کۆمەڵایەتی نەریتپارێزانەیە ، کەواتە لە سەروەختی شەڕی گەورەی لەدژی بەهاکانی نەریتپارێزانەی لەماوەی شۆڕشی ساڵی١٧٨٩ی فەرەنسەدا،فاشیزم پەیوەندیەکی نزیکی هەبوە لەگەڵ ئایدیاکان،ڕایەڵەکان وچینە چالاك کاریگەرەکانی شارستانیەتی خۆرئاواو هەر ئەم پەیوەندییە لەلایەن ژمارەیەکی کەمەوە نەبێت چیتر هەوڵ نادرێت سەرهەڵدانی فاشیزم وناسۆنالیزم بە گوناه بەڕواڵەت ناوازە ولەکوێ ئەڵمانێکان یاخود دژە ئەقڵانیەتی ئەهریمەنی مرۆڤی مۆدێرن یان تاوانکاری کۆمەڵێك ڕابەری

نیهلیستی یەکگرتوو بەرانبەر دەسەڵات بژمێرێت بەڵام هێشتا هەوڵی پێویست نەخراوەتە گەڕ بۆ خستنەڕوی ترسی پارێزگارانی نەریتگەرا لەلایەن باڵی ڕاستی ڕادیکاڵەوە ئەمەی کە چۆن ئەم باڵە دەبێتە سەرچاوەی هیواکانی ئەوان،هیوادارم بتوانم ئەم ڕاستیە پشانبدەم کە دەسەڵات گرتنە دەستی کۆنەپەرستە شۆڕشگێڕەکان لە ئیتالیا وئەڵمانیادا هۆکەی زیاتر ئەمە بوو کە کەڵکیان وەرگرتوە لە دەسەڵات و پشتیوانی چینە نەریتپارێزە کۆنەکان و ئابڕوی نەریتی فیکری لە پێشدا سەقامگیر بوونی نەریتپارێزان.

بێگومان پشتگوێ خستنی جیاوازیە گەورە وڕاستەقینەکانی نێوان چینەکان و ئایدیاکانی نەریتپارێزانی کۆن وتیرۆریزمی ڕادیکاڵی فاشیزمی ئەورووپی کاریگەرێکی هەڵەیە بەڵام یکجار جەخت لەو جیاکاریە کراوەتەوە لەڕاستیدا بەپێشنەگی فاشیزم لەقەڵەمدانی بیسمارك کارێکی بێمانا ودەبەنگانەیە.

سەرکەوتنی فاشی ونازێکان هۆکەی ئەوە نەبوو کە ئەوان دووپاتکەرەوەی بەها وپەیوەندێکانی چەند بیرمەندێکی نەریتپارێزبون ، بەڵکو سەرکەوتنی ئەوان تاڕادەیەك پەیوەندی بەمەوە هەبوە کە ئەوان وەڵامدەرەوەی خواستەکانی خاوەن زەویانی ئەرستۆکرات ڕابەرانی سەربازی خاوەن پیشەسازییە

دواکەوتوەکان وردە دوکانداران وە جوتیارانی وردە مولکدار، مـن لاریم نیە لەوەی کە ناکرێت بەپێ ئەوەی کە گوترا ئەم گروپانە بە پشتیوانی هێنایەکایەی ترس وتۆقاندنی بێ سنوری ئۆردوگاکـانی مـەرگ وبـەرپاکردنی جـەنگی جیهـانی دووهـەم تۆمـەتبار بکـرێن چـونکە زۆرجـار لـە بڕیـاردانی سیاسـیەکاندا تاکـەکان خوازیـاری دەرئەنجامـە نەڕاسـتەوخۆکانی ئـەو گروپـە کۆمەڵایەتیانـەی کـە بـەرگری بەرژەوەندیـەکانی خۆیـان دەکـەن وکەوتونەتـە بـەر مەترسـیەکی گـەورە ئـەوا بەشـێوەیەکی کـرداری لەبـەردەم سنورداریيەکی توندان لە هەڵبژاردنە سیاسیە جیاجیاکانـدا وئەمـە هۆکارێکـە کـە نابێـت فێرخـوازانی زانسـتی سیاسـی مێژوناسـانی بیرمەندیش پشتگوێ بخەین هەرچەندە بزوتنـەوە فاشسـتێکان لـە هەمو وڵاتە مۆدێرنەکانـدا هەن،بـەڵام هـەر وەکـو ئـەزمونی ئیتالیـا وئـەڵمانیا پێـشانیان دا کاتێـك فاشـیزم چـەکەرە دەکـات کـە ڕاستەوخۆ یان نەڕاستەوخۆ بەپـشتیوانی یـەکێتی دەسـتە بێـژانی بەهێزی پێش لیبڕاڵ نیمچە فیـۆداڵ یـاخود ئەریـستۆکرات خـاوەن پیـــشەسازیە کۆنەپەرســتەکان وئاتیمـــە شـــێوە کۆمەڵایەتیـــە بەناوداچـوەکانی چـینی ناوەنـدی خـوارەوە بگاتـە دەسـەڵات یەکێتیـەکی وەهـا بـە لەبەرچـاوگرتنی ململانـێ کۆمەڵایەتیـە توندەکانی دەرکەوتـەی جـەنگی سەرتاسـەری ونالـەباری ئـابوری

وئەگەر نەڵێین بە دەست ئەنقەست بەڵام بەئاسانی دەبێتە قوربانی و دەسکەلای سەرسەخترین دوژمنانی لیبرالیزم وڕادیکالیزم واتە ڕادیکاڵە ڕاستڕەوەکان بە فاشستەکان ونازێکان دوابەدوایی گەیشتن بەدەسەلات چیتر ئامادە نەبون وەکو کەسانی خۆبەخش وەفادار پارێزگاری بەرژەوەندی ئەو کەسانە بکەن کە گەیاندبویانە دەسەڵات وپلەوپایەی ئەوەی ڕاست بێت کرێکارێکی وەهایان لە دەست نەدەهات ئەگەر فاشیزم بەشێوازە سەرکوتگەریەکانی پێشوو یاخود حکومەتە ئیتلافیە تەواو نەریتپارێزەکانی وەکو رژیمی فرانکۆپیلسۆدسکی یاخود هۆرتی ڕەفتاربکات ،ناتوانێ لەدەسەڵاتدا بمێنێتەوە،فاشیزم نەریتپارێزی نیە تگەرانیە بەڵکو نەریتپارێزی شۆرشگێرەو دەبێت سیاسەتێکی تاکڕەو سەراپاگیرو کارا بگرێتە بەر بۆتوقاندنی سیستماتێکی و بەکاربردنی کۆنترۆلێکی تەواو بۆ هەمو پانتاییەکانی ژیانی نەتەوەی،چونکە فاشیزم لەو کۆمەڵگایەنەدا دەگاتە دەسەڵات کە هێزە مێژوییە پەرەستێنەکانی لیبراڵیزم وڕادیکاڵیزم نەریتپارێزانی چینەکانی سەرەوە خوارەوەیان ڕوبەڕوی شەڕێکی چارەنوساز کردوتەوە،تاکڕەوی نەریتی تەنیا لەوکۆمەڵگایانەدا دەتوانێت بەئاسانی ڕکێفی لیبراڵیزم وەچەپکەرای بکات کەپێگە کۆمەڵایەتێکان مۆدێرنیزم بەهەمومانا شاراوەکانیەوە کەمبن.

بــــــەکاربردنی توندوتیـــــــژی بێبەندوبار،پەڕاکەنـــــــدەو ڕێکنـــەخراوەکانی دیکتاتۆریـــەتی کـــۆن تـــەنیا لەوکۆمـــەڵگا دواکەوتوانـەدا کارێگەرەکـەلیبراڵیزم بـەهۆی ئامـادەی بـەردەوامی دەستەبژێران سیستمی کۆمەڵایەتی پـێش لیـبراڵ وەکـو ئیـسپانیا هـــەنگاریا لاوازکرابێـــت، ڕەنگـــە لـــەم کۆمەڵگایانـــەدا خـــود نەریتپارێزەکۆنـەکان بـەهۆی دوور ڕوانینیـان هاتنەکایـەی تـرس وتۆقانـــدن وڕەکێفکردنـــە کۆمەڵایـــەتێکانی هێـــزی تۆتالیتـــاری فاشستی وەکو مەسەلەیەکی مەترسیدارو ناپێویست ڕەتبکەنەوە.

ئایـدۆلۆژیای فاشـیزم لـە بنەڕەتـەوەزادەی دژە ئەقڵانیـەتی مۆدێرنەیە ولەم ڕووەوە پەیوەندیەکی کەمی هەیـە بـە نـەریتپارێزی نەریتیـەوە بۆسـەلماندنی ئـەم ووتەیـە، زۆرجـار ئامـاژە دەکـرێ بەکاریگەری گـەورەی جۆرج سـۆرێل لەسـەر ئایـدۆلۆژیای ڕاسـتی ڕادیکاڵ لەسەدەی بیستەمدا ناتوانرێ نکولیٚ لەکاریگەریەکی وەها بکـرێ هەرچـەندەزیاتر سـنورداربوە بەفاشـیزمی ولاٌتـانی لاتـین ..بیروڕاکـــانی ســـۆرێل وەك زۆرێـــك لەفاشـــستەکان لەوانـــەش مۆســـۆلۆلینی ڕەوتێکـــی سیاســـی بـــــەرفراوانی لەچـــەپی شۆڕشگێریەوە بۆڕاستی شۆڕشـگێر گرتـەوە ، هەرچـەندە ئـەویش بـەپیٚ شـێوازی بـاو، وەکـو مۆسـۆلۆلینی بەدرێـژایی ئـەم ڕەوتـە هەرگیز هەڵوێستی دیموکراتیك یـاخود ڕیفۆرمیـستێکی هەڵنەبـژارد

ڕوناکبیرانی فاشستی گەنج دەرکیان بە ڕەنگدانەوەی زۆرێک لە ئایدیاکانی خۆیان دەکرد لەبەرهەمەکانی سۆرێلدا،سۆرێل گەلێک لە تیۆرەکانی دەستە بژێر گەرای باوی سەرەتاکانی ئەم سەدەیە وەردەگرت بۆدەربڕینی ڕقی خۆی لەدیموکراسی بۆرژوازی ئەمەی کە پێدەچوو خۆشەویستی بێت بەرانبەر نەرم ونیانی هەلکردنی سیاسی هەم لیبراڵەکان وهەم سوسیال دیموکراتەکان تومەتبار دەکرد بەچاوتێبڕینی مادی _زۆر سۆراخەکردنی ئیشە پڕاهاتەکان.

سۆرێل سوربوو لەسەر ئەوبڕوایەی کە بە تەنیا خەباتی کۆمەڵایەتی مرۆڤایەتی لەم بەربەریەتەداڕوخاوی پەرلەمانتاریستە خۆفرۆشەکان دیموکراتە دەبەنگ وهیومانیستە ترسنۆکەکان پاک دەکاتەوە.

بەم شیوەیە ئەم توندوتیژییە دەستەیی لەسەر بنەمایی یەکێتی گروپی ئایدیالیستانەی بەرز ڕادەگرت کەپیلانی شۆرشگێری بەرژەوەندیە تایبەتێکان دەکەنە قوربانی ، بۆ بەدێهنانی ئەفسانەیەکی کۆمەڵایەتی لەرێگەی وەرچەرخانێکی کاولکەرەوە ، لە ڕوانگەی شیۆنکەوتوانی ئایدیالیستی یەوە...بزاڤی فاشیزم بزاڤێک بوو ڕابەرایەتی گروپێک لەدەستەبژێرانی جەنگاوەر،یەکگرتوو بەدیسپلین وئامادەی هەموو

جۆرە بەکاربردنێکی زۆردارانەی پیویست بە مەبەستی لەشانۆ وەدەرنانی فەرمانڕەوایانی لاواز ئاسودەی خواز پابەندی هەڵکردن لەگەڵ ئەوروپای روو لەنەمان....سۆرێل وشیۆنکەوتوانی حەزێکی وەها ئاشکرایان نەدەخستە روو بۆ بەدێهنانی ئەفسانەیەکی تایبەتمەندی  کە لەسەرو فەرمانڕەوایەتی گروپێکی دەستە بژێری شۆرشگێرەوە بێت...بە بۆچونی ئەوان مومارەسەی ئەفسانە ئەمەبووکە ئیلهام بەخشی بێت،ئەم دژە ئەقڵانییە لە قۆناغێکی سۆرێلی ستایشکردنی لینین وهاندانی توندوتیژی پرۆلیتاریای کێش کرد لەدژی سەرمایەدارانی داڕوخاو لەگەڵ ئەوەشدا سۆرێلیش سەرئەنجام وەکو شیۆنکەوتوانی فاشستی خۆی ڕوی ڕاستی ڕادیکاڵ ڕاکێشرا  ئەو لەفەرەنسا هاریکاری  کۆمەڵەیەکی پێکهاتوو لەمیلیتاریستەکان نەریتپارێزانی ڕادیکاڵ پاشایەتخوازان وناسیۆنالیستە ڕادیکاڵەکانی دەکرد کە دەیانویست بەزۆرداری تۆقاندن وکۆتایی بە هەڕەشەی لیبرالیزم سوسیال دیموکراسی بێنن.

فاشیزم نە بەئیرادەی ئەهریمەنانەی مرۆڤی مۆدێرن بۆ دەسەڵات گرتنەدەست دادەنێن ونە بەشێکی لە بنەڕەتەوە جیاواز لەگەڵ بەها نەریتێکانی نەریتپارێزی وێنای دەکەن.نەریتپارێزی نەریتی جگە لەو جۆرە ڕادیکاڵە کە لەچینی ناوەندی خوارەوە نە

تیرۆریستەو نە تۆتالیتار ، سەروەختێك كە سۆریل وفاشستەكانی تـر دەربـارەی بـەرزێتی ئـیرادە ئەفـسانە وتوندوتیـژی بەرانبـەر بزوتنەوەی هێزە مادییـە مێژوییـەكان قـسەیان دەكـرد لەڕاسـتیدا ئاارستەیەكی سیاسی ناوازە یاخود نابەجێیان نەدەخستەڕو،ئەوان دەیانویـــست بنیاتنـــانی ئـــەو تۆقانـــدن وكۆنترۆڵـــە چـــالاك وتەواوتوتالیتارە بخەنەڕوو كە بەگوێرەی ئـەوان پێویـست بـوو بـۆ پاراستنی بەهاكان وبەرژەوەندیەكانی نەریتپارێزی.

## تێڕامانی عەفلەق وبەعسیزم بۆ ناسیۆنالیزمی ڕۆژئاوایی

لەبیر ودیدی گشتی عەفلەقدا بە شـێوەیەكی سیـستەماتیك زۆر دووبارە كراو هێرش دەباتە سەر دۆخـی ڕۆخانـدن و خۆپەرەسـتی وخەمـساردی و هەرسـهێنان كـە هەڕەشـە لەمانـەوەی كیـانی نەتـەوەی عـەرەب دەكەن،عەفلـەق لـەزۆر بۆنـەدا هەڕەشـەی لەناوچوون بەرامبـەر عـەرەب ئاگـادار دەكاتـەوە ، ئـەم هـەرەس ولەناوچوونەشی مەبەست لەڕۆحی بزێـو وچـالاكی ڕابـردوی عروبـە بووە.

لێکـچونی بـیری ناسیۆنالیـستانەی ڕۆژئـاوایی وەکـو فیختـە ومۆراس وریـنان وبەرێس وەبیر دێنێتەوە،تێبینی دەکرێ ئەمانەش سەرچاوەی ئیلهامی بیری فاشـستی ومێـژووی بـون ناسـیۆنالیزمی عەرەبی وخۆرئاوایی بەدەر لەجیاوازی ژینگە وکولتـور وبـارودۆخی مێژووی هەمویان دژی بێگانە دەوەسـتنەوە هـەروەها شـانازیەکی کوێرانـە بـەڕابردوی خۆیانـەوە دەکـەن بەوپـەڕی توندوتیـژیـەوە ڕەخنە لەدۆخی ئێستا دەگرن.

لەڕوانگەی میشل عەفلەقەوە ناسیۆنالیزم لەپـشت ئـەو هێـزەی کـە خـۆراك دەبەخـشێ بـە بـەها پۆزەتیڤـەکان(هێـزی دروسـتکەر ووزەی ژیاو،توندوتۆڵی شـاراوە ڕۆحـی عـەرەب ودەرونـی عـەرەب عـەرەبی نـەمر ـ پـەیامی نـەمر ـ دەوەستیـچتەوە.عەفلـەق لەسـەر وێنـەی ڕابـردوو هێـزی پاڵپێوەنەر،بژێنێتـەوە وەڵام بـۆ دۆخـی نێگەتیڤ لەناو ناسیۆنالیزمدا...ناسیۆنالیزمێك کە توانـای ئـەوەی هـەبێت کۆتـایی بـە تێکـچون وهەڵوەشـانەوەی بـەها ناتـەواتێکان بهێنێ وناسیۆنالیزمێکی سەرەتای وبەووزە کە بتـوانێ سەرشـۆڕی ونزمبونەوەی مرۆڤی عەرەبی پچڕاو ودوورلە ڕۆحـی نەتـەوەی بـێ بەشکراو لەکۆمەڵگای نەتەوایەتی بەرپـەرچ بداتەوە...ناسـیۆنالیزم تەنها ڕێگـەی رزگـاربوون لـە فـەوتان ئـەم قەناعەتـەش سـەنتەری

بیرکردنەوەی ڕۆژانـی ڕابـردوی سـالآنی جـەنگی جیهـانی دوهـەمی خۆرئاوایە لە پەرێس ودریمۆن وفیختە وهتد...

بەلآم عەفلەق نزیکترە لە بەرێس وڕێنـان لەلایەکەوە لەلایـەکی تریشەوە فیختە...عەفلەق ناسیۆنالیزم بەرەنگاری پێدەکات دژی هەرەسهێنان ، کەواتە عەفلەق لاسایی ناوبراوەکان دەکاتەوە.

بـابزانین خـاڵی هاوبەشـی عەفلـەق وناسـیۆنالیزمی ئـەوروپی چین؟

١-هێرش بردنە سەر خۆپەرستی وخراپبونی بـارودۆخی ژیـانی نەتەوە.

٢-بانگەشــە کــردن بــۆ دۆزینــەوەی چارەســەرێك بــۆ ئــەم بارودۆخە نەگەتیڤە.

٣-بنـچینەی ســەرەکی ئـەم چارەسـەرکرنە بــە زێدەڕۆیــەوە سەرچاوە لە شانازی کردن بە باوباپیرانەوە دەگرێ.

٤-جەوهەری سۆز وپەرستنی باوبـاپیر بریتیـە لـە ناسـیۆنالیزم مۆریس بەرێس یەکێك بـوو لـە نوێنـەرە هـەرە سـەرەکێکانی دژی جولەکە ویەکـەم دانـەری بنـچینەکانی فاشـیزم بـوو بانگەشـە بـۆ ناسـیۆنالیزمێك دەکـات کـە توانـای ڕەتدانـەوەی نـزم بـون وکـەم بونـەوەی میلـەتی هـەبێت و دژی هەڕشـەی فەوتانـدنی نەتـەوەی فەرەنــسی پــاش بەزاندنەکــەی ســاڵی١٨٧١بوەســتێ...لــەم

تێڕوانینەوە بەرێس سکاڵای خۆی بەرامبەر ونبونی کەسایەتی هاوڵاتی فەرەنسی دەردەبڕێ ودەڵێ:_هەستدەکەم کە هاوڵاتیگەری فەرەنسی نزم بوەتەوە فەوتاوە،واتا ئەو پاك وپوختەیەی کە ماوە کە پشت گیریمان لێ دەکات..بەرێس بۆ چارەسەرکردنی ئەم داغان بونەش پەنا دەباتە بەر گوڕ وپاڵەوانێتی وچالاکی هێزی جاران وەهەمی ڕابردوو وزەی دروستکەر ئەمەش بەمانای جوڵاندنی هێزەکانی هەست لەبەرژەوەندی نەتەوە بەکار دێ،نەك نەتەوە وەك سیستەمێك لە بیروباوەڕ...بەرێس دەڵێ:_نەتەوی فەرەنسی کە دابەش بوە توشی مەینەتی بوە لەچەند تاکێکی تەنها گۆشەگیر پێکهاتوە کە توانانی پێشخستنی بەرژەوەندی گشتیان نەماوە منی تاکە کەسی کە بەشێوەیەکی زۆر خراپ لەناو چوە دەبێ ڕەسەنی خۆی لە بەردەوامبونی نەوەکانی پێشودا بدۆزێتەوە...ئێمە نەوەی باوباپیرانمانین لەناو دڵمان بیردەکەینەوە وە بیردەکەینەوە و قسە دەکەین گشت زنجیرەی میراتگرەکانمان یەك ڕەچەڵەك پێکدێنن..داهاتوی دەبێ بە گۆڕەپانی کردەوەی پراکتیکی کیانێکی یەك پارچەی کەڕابردوو ئێستا وداهاتوو پێکەوە دەبەستێ ودەیپارێزێ.

بـــەلام ئـــەوەی زۆر کاریگـــەری کردوەتـــە ســـەر عەقلـــەق بیروبۆچونەکانی فیختەیە،ناسیۆنالیزمی عەقلـەق جێگایـەکی پـان وپۆڕ دەهێڵێتەوە بۆ تەوژمی بـیری فیختـە..دەبـێ ئـەوەش بڵـێین ســکالا دەربــڕین بەرامبــەر خۆپەرەســتی وێکــچونی مــۆراڵ و کۆیلایەتی ولاوازی وگەندەڵی،نەتەوە بەردی بناغەی ناسیۆنالیزمی زمانی ڕەگەزپەرەستێکەی پێکدێنێ سەبارەت بە نەتەوەی ئەڵمان فیختــە دەڵــێ: خۆپەرەســتی گەیــشتوەتە لوتکــەی پایە،جگــە لەحاڵـەتی دەگمـەن خۆپەرەستی توشـی گشت حـوکم کراوەکـان حوکمکەران بوە وبو بە تـەنها جۆڵێنەری بونیات..نەتەوەی ئەڵمان کە دوچاری بێگانە بوەتەوە گشتی شانازی بە یەکێتی نەتەوایەتی خۆی ونکردوە..کاتی ئەوە هاتوە کە سەردەمێکی نوێ دوابەدوای خۆپەرستی وداگیرکردنی بێگانە بێتە ئاراوە،کاتی ئەوە هاتوە کـە نەتەوەی ئەڵمان یەکێتی وپەیوەندی نەتەوایەتی خـۆی بدۆزێتـەوە لە پێناوی ئەوەی کە نەتــەوە بەتـەواوەتی نـەڕوخێ زۆر پێویستە بــــە زوتـــرین کـــات نەتـــەوەی ئـــەڵمان یـــەکێتی خـــۆی بژێنێتەوە،بەوردیـەوە تەماشـای کلۆلێ خـۆی بکـات هـەمان ئـەو قسانەش لەزاری صدام حسێن وە زۆرجار دەوترا ( کوا سمێڵ کـوا پیـــاوەتی کـــوا شـــەهامەت ) ئـــەم زمانـــە زمـــانی زۆربـــەی ناسیۆنالیستەکانی جیهانە.

هەروەها فیختە دەیوت:_نەتەوەیەك بەم شێوە نزم بوەتەوە ناتوانێ خۆی بەدیبێنێ ویەكێتی مسۆگەر بكات ئەگەر بانگەشە بۆ چارەسەرێكی ڕەها نەكات كە بریتیە لە خۆلقاندنی پەیڕەوێكی نوێ وتەواو. پێویستە نەتەوەی ئەڵمان ببێ بە كەسایەتیەكی یەكگرتوو ئەگەر بیەوێ لە نزمی ڕزگاری بێت وجارێكی دیكە بژێتەوە هەستێكی بەرز بۆ خۆی بخولقێنێ.

بیری عەفلەق سەبارەت بە ناسیۆنالیزم وەكو ناوی كەسێك وایە لەڕوانگەی ساتی لە دایكبونمانەوە لە گەڵماندایە وەك شێوەی دەموچاو وایە كە قەدەر بۆی نوسیوین تەنانەت پێش لە دایكبونمان كە لەباوباپیرانمان بۆ ماوەتەوە.

بەهۆی ناسیۆنالیزمەوە پیاوی عەرەب ڕوو لە كەسایەتی خۆی هەڵدەماڵێ و ئەگەری مرۆڤی عەرەب بەرامبەر ئەم نازناوە هۆشیار بێت ئەوا دەتوانێ لەژیانی پڕ لە ڕواڵەت دەربچێت و بچێتە ناو بازنەیەكی كە گەرمی وهێز ببەخشێ بە ژیانی وەك ئەنجامێكی ئاراستەی ژیان وسیمای پیاوەتی لێ بنیشێ. بەلای عەفلەق وفیختەشەوە ناسیۆنالیزم هێزێكی مێژووی سیاسیە كە مۆركی خۆی بەشێوەیەكی چەسپیو ولەسەر زنجیرەی ڕووداوەكان دادەنێ.

پیاوی عەرەب کە باوەڕ بەم قەدەرە دێنێ کەناتوانێ لێی دوور کەوێتەوە دەبێ لەسەر شانۆی ژیان وکردەوەکانی بەگوێرەی ئەم قەدەرە پڕبێت لەپاڵەوانێتی لەبەر ئەوەش شتێکی بێ کەڵك دەبێت ئەگەر مرۆڤ هەوڵبدات بێباك بێت بەرامبەر ئەم پەیوەندیانەی کە چەند سەدەیەك ئەوەیان بە نەتەوەکەیەوە بەستوەتەوە..پیاوی عەرەب دەبێ ڕەسەنی خۆی لەڕابردوودا بدۆزێتەوە چونکە ژیانی حازری تەنها نائومێدیەکی پوخت دەنوێنێ..دەتوانرێ بوترێ کەناسیۆنالیزمی باوباپیری میشیل عەفلەق هێشتا زۆرزۆر قوڵترە لە پەرێس یاخود فیختە.

لەهەمو نوسین وبۆنەیەکدا عەفلەق بێ دڵی ناکات لەدووبارەکردنەوەی ئەوەی کە تاك هیچ شتێك نییە ئەگەر ژیانی بباتەسەر بە بێ ئەوەی بزانێ کە لقێکە لەڕوەکەی کە لەناو جەرگەی ڕەگی داکوتاوە،تاکەکەس تەمەنی دەژی ونازانێ کە ئەولقێکە لەڕوەکێك کە ڕیشەی بەناو ڕابردوو ڕۆچوە وپەلەکانی بەدرێژایی جاخەکان درێژ دەبنەوە نازانێ کە ئەو یەکێکە لەملیۆنا کەس کە بەدوای یەکدا لەسەدەکان ونەوکانەوە هاتوون زەوییان کێڵاوە وشارستانیەتیان بنیات ناوە هزریان دروست کردوە وگیانیان بەخت کردوە جەنگاون ولە مەیدانی جەنگدا لەناو چون..هەموو ئەمانەش بۆ تۆمارکردنی مێژوی نەتەوەکەیان بوە

دێربەدێر،بنیاتکەر بەردبەرد بخەنەسەر یەك وبلیمەتی خۆیان دەربخەن وپەیامەکەیان بەردەوام بێت ئەندامانی نەتەوە لەماوەی چەند سەدەیەك پارێزگاری خۆیان کردوە خەباتیان کرد وبەرگریان لەبارودۆخی دژواری پڕلە کەندوکۆسپ کرد لەپێناوی ئەوەی لەتاریکی نەبون دەربچن ڕوناکی ببینن،بەلاّم لەسەردەمی لاوازی زەلیلی ودواکەوتن وپەرتبون ئەم بەرپرسێتیە ئەوەندە ئاسان نابێت وهەرچەندە ئەم بەرپرسێتیە سەخت وپڕلە ناخۆشیە، بەلاّم حەکەمێکی ڕەوایە چونکە پاڵەوانێتی بەئەندازەی ژیانی سەخت دەپاڵێوێت،دەبێ بەرێگەیەك بۆ ڕزگاربون لە ئیمپریالیزمی بێگانە وبەرهەڵستی بەرامبەر مەترسی دابەش بون..وەك دەبینرێ ناسیۆنالیزمی عەفلەقی بریتیە لە بەرپەرچدانەوەی بۆ دۆخی قەیرانی سیاسی وبوونی(وجودی).

لەساڵی١٩٤٠میشیل عەفلەق ڕەخنە لەهەموو پێناسەیەکی تیۆری ناسیۆنالیزم دەگرێ وهێرش دەباتەسەر ئەوانەی هەوڵ دەدەن ناسیۆنالیزم..بەڕۆشنبیری بکەن..لەهەوڵدانیدا بۆ وەلاّمدانەوەی هەموو دەستپێشخەریەك بۆ پێناسەکردنێکی ڕۆشنبیریانەی ناسیۆنالیزمی عەرەبی..میشیل عەفلەق دەڵێ:_دەترسم ناسیۆنالیزم لای ئێمە هێندە کەم بکرێتەوە بۆ زانیاریەکی ئاوەزی ڕۆشنبیری لێکۆڵینەوی وشەی شێوەیە هێزی

دەمار وگەرمای سۆز بکات..لەوە دەگات گەنج وخوێندکار باوەڕیان بە بەستنەوە بە ناسیۆنالیزمەوە لەڕێگەی ڕادەی پێناسە کردنیان بۆڕاستی یا هێزی ئەم پێناسە کردنەوە بێت،هەرچەندە دەبێت باوەڕ پێش هەموو زانیاریەك بێت وگالتە بەهەموو پێناسە کردنێك بکات..بەڵام ئەوە واتە ناسیۆنالیزمە،کە ڕێگە ڕوناك دەکاتەوە..

بۆزانیاری ئەو ناسیۆنالیزمەی کە بانگەشەی بۆ دەکرێن پێش هەمو شتێك بریتیە لە خۆشەویستی،بریتیە لەهەمان سۆز کە تاك بەخێزانەکەیەوە دەبەستێتەوە،هەرچۆن خۆشەویستی بوونی نییە ئەگەر نەبەسترێتەوە بە خۆبەختکردن،بەمشێوەیەش ناسیۆنالیزم..بونی نیە ئەگەر نەبەسترێتەوە بەخۆبەختکردن ئەوە کە شتێکی خۆشتر دەوێ گوێ ناداتە هۆی خۆشەویستێکەی ئەگەر پرسیاریش بکات هیچ هۆیەکی ڕون نادۆزێتەوە،ئەوەی کە توانای نیە بە بێ هۆیەکی ئاشکرا واتای ئەوەیەکە خۆشەویستیەکەی نەماوە وتەواو بوە ومردوە.

میشیل عەفلەق بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ باوەڕی ناسیۆنالیستی بە باوەڕی ئاینی دەشوبهێنێ واتە باوەڕی ناسیۆنالیستی دەخاتە شوێنی باوەڕی ئاینی..بەلای عەفلەقەوە ناسینالیزم هەستێکە کە لەڕێگەی باوەڕەوە نەبێت هیچ شتێکی دیکە تەکیدی لێ ناکرێ

بەهای باوەڕهێنان دەگەڕێتەوە بۆ فۆرم وپاسای هەڵسوکەوت کە لەلایەن هێزی میتافیزیکەوە پێناسە دەکرێن وسنوریان بۆ دادەنرێت و لەڕێگەی ئەم هێزانەشەوە کۆمەڵگەی نەتەوایەتی بونی زامن دەکرێ تەواوی یەکێتی ئەندامان لەلایەن ناسیۆنالیزم وداخوازی پێشنیازەکانیەوە سنوریان بۆ دادەنرێ چونکە کاتێ کەباوەڕ بە ناسیۆنالیزم دەخاتە باوەشی خۆی بەهای خۆبەستن بە ئەوە زیاد دەکات وخۆبەختکردن دەبێ بە ئیمپرتیڤیکی ئەخلاقی.

لێرەوە پەسەندکردنی بێ مەرجانەی باوەڕی خودایی بەکۆی ناسیۆنالیزم لەڕێگەی نەبونی زانین وحوکمی لۆژیکەوە دەبینرێ،کۆمەڵگەی ناسیۆنالێ دەبێ خۆی لەسەر بناغەی بۆچونێك ڕێکبخات کە زانین لێکۆڵینەوەی لۆژیکی بتوانێ پاساوی بکات.

میشیل عەفلەق دەڵێ:_بنچینەی نەمری کارەکانمان کە ناگۆڕێ وهیچ شتێك جێ ناگرێتەوە بریتیە لەباوەڕ گەشبینیش شێوەیەکی ساکارە لە دەرکەوتنەکانی باوەڕ.

بەلای عەفلەقەوە بەڕۆشنبیرکردنی نەتەوە کارێکی دژە ناسیۆناڵە بابزانین بۆچونی ئەم پیاوە چیە؟

_ناسیۆنالیزم خۆشەویستیە وهەوڵدان بۆرۆشنبیرکردنی ئەوە دەگەیەنیٚ کە بیکەین بە شتێکی ئەپستراکت ودوایش دەماری ژیاوی لابەرین،وایی لیٚ بکەین تین وگوڕی سۆزی نەبێت ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنیٚ کە ناسیۆنالیزم دەبیٚ هێزی خۆی لەسۆز وهەستی کوێرانە لەگۆرێکی ناوخۆی کە رەگی داکوتاوە لە ناقولاّی نالۆژیکیدا وەرگریت،عەفلەق ناسیۆنالیزم لەسەر بنچینەی ئەو هێز وغەریزەیە میکانیکیە بنیات دەنێت کەمرۆڤ دەبزوێنیٚ وهەناوی گشت رۆحی هەروەکو کانت دەڵیٚ:ـ سۆز یان حاڵەتی عاتفی قولٚ هەستێکە ناهێڵی مرۆڤ بگاتە بیرکردنەوە و فرێی دەداتە ناوجەرگەی بیرکردنەوە.ئەم بۆچونەی کانت کە لەبواری فەلسەفەی تێراماندا واتای قوڵی خۆی هەیە، لێرەدا پەیوەندیەکی راستەوخۆی نیە بەئامانجی بابەتەکەمان بەلاّم بیری عەفلەق شیدەکاتەوە:عەفلەق لەم رێگەیەوە دەیەویٚ بنچینەی کۆمەلاّیەتی بگۆڕیٚ وبیکات بەحاڵەتێکی عاتفی بەهێز وخاوەن وەزیفەیەکی مۆراڵی..بە دورخستنەوەی ناسیۆنالیزم لەزانیاری لۆژیکی عەفلەق هەست وسۆز دەگۆڕیٚ بۆ ئەمرازێکی بەهێز وقەوارەی نالۆژیکدا جۆشی فەزیلەی پاڵەوانێتی وشۆڕشگێڕی لە دڵی جەماوەر دەبزوێنیٚ بەعس لەم رێگەیەوە پالٚ بەتاکەوە دەنیٚ بۆ دروستکردنی نەخشەی کۆمەڵی نەتەوایەتی..عەفلەق وبەعسیزم تا

سەر ئێسقان نالۆژیك بون.هیتلەریش عەقیدەی ناسیۆنال سۆسیالیزمی لەسەر بنچینەی سۆز وهەست وئەوینی نۆستالیژیای بەجۆش نەك لەسەر بناغەی پانۆراما ڕۆشنبیریەكان..ناسیۆنالیزمە ڕۆحێكەی هیتلەر دەبوایە دوور بوایە لە هەموو ڕێكخستنێكی تیۆری بۆ كاركردن لەسەر فراوانترین بەشی كۆمەڵ.

بەلای عەفلەقەوە ناسیۆنالیزمی بەعسی عەفلەقی بانگەشە بۆ تەوژم وهێزی ڕۆحی عەرەبی دەكات ، بەلای ئەم پیاوە هەژاری پێش هەموو شتێك هەژاری ڕۆح واتا پێش هەژاری كۆمەڵ لەبەر ئەوە دەبێ كاربكرێتە سەر ڕۆح كە لە پشتی ڕۆحی نەتەوایەتی لە دۆخێكی شاراوە ماوەتەوە.

بۆ بەعسی عەفلەق ئەوە زۆر گرنگ بوو كە ئامانجی خولقاندنی كۆمەڵی بەعسی بوو بۆ ئەم مەبەستەش هێرشی دەكردە سەر ڕۆشنبیران، هیتلەریش بەهەمان شێوە دەیوت:_تاكتیكی باش لەبواری سایكۆلۆژی جەماوەردا بریتیە لە دورکەوتنەوە لە هەموو شیكردنەوە كە ئامانجی سەلماندنی ڕاستی شتێك بێت وپێویستە تەنها ئامانجی كۆتایی گەورە وباسبكرێ..پڕكردنی مێشكی جەماوەر بەشیكردنەوەی بابەتی ولەڕێگەی ئانالۆژی دوور ودرێژ دەبێتە هۆی ئەمانی كە ئەوەی دۆركهایم پێ دەڵێ:_دۆخە بەهێزەكان ودیاریكراوەكانی هۆشیاری كۆ..لەپێناوی گەشتینە

ئامـانجی کۆتـایی گـەورە پێویـستە بیربکرێتـەوە لـە یـەکگرتن وئامـادەکردنی تـەواوی ئـەووزە وپێکهێنەرانـەی کـە ڕێگـە خۆشدەکەن بۆ بەرزکردنەوەی شەرەفی ڕۆحی عەرەبی.

لەڕێگـەی ئـەم بیروباوەڕانـەوە هـەوڵی عەفلـەق بـۆ بەئەفسانە کردنـی ناسـیۆنالیزم بـوو..ئەفـسانەش بریتیـە لەگێڕانەوەیـەك پەیوەنـدی بەخواکانـەوە هەیـە..ئەفـسانەش هـیچ پێویـستی بەشیکردنەوە نیە بەڵکو دەچێتە نالۆژیکیەوە هەر لـەم ڕێگەیـەوە دەیویست ژیان وواتایەکی چەسپیوە ببەخشێ بەعروبە.

لەبـەر ئـەم بیروڕایانـە عەفلـەق هەمیـشە دەیویـست ئەفـسانە ببەخشێ بە ناسیۆنالیزمی عەرەبی،چونکە ئەگەر بـەهۆی زانیـاری ڕۆشنبیری شیتەڵکردنەوەی وشەی ناسیۆنالیزم بخنکێنـرێ ئـەوجا هێزی ئەفسانەی بەعس دەفەوتێ.

سۆرێل پێی وابوە..دەتـوانرێ بـە بـەردەوامی بـاس لەڕاپـەڕین بکەین بەڵام ئەگـەر ئەفـسانەیەك نـەبێ کـە لەلایـەن جـەماوەرەوە پەسـەند بکـرێ ئـەم ڕاپەڕینـە نابێتـە هـۆی بزوتنەوەیـەکی شۆڕشـگێڕانەی ئەفـسانە ، ڕێگـە پاکدەکاتـەوە بـۆ تێگەیـشتنی چالاکی و هەسـت وبـیری جـەماوەری گـەل وخـۆی بـۆ خـەباتێکی بڕیـاردەر ئامـادە دەکـات..ئەفـسانە بـریتی نییـە لـە وەسـفکردنی شت،بەڵکو گوزارشت لە ویست دەکات.

صدام حسێن دەیوت:_مەرجی بەردەوام کە شۆڕشگێڕ پێویستە لەکاتی خەباتدا پێوەی پابەند بێت،بریتیە لە هێرش بردن وبەرەنگاربونەوە،ئابەم شێوەیە کە ناسیۆنالیزم وەك خۆشەویستی دەبێ جۆشی خەبات..فراوان بکاتەوە بۆ ئەوەی ئایدیالی بەعس سەرکەوێت..بەعسیەك دەبێ سروشتێکی دڕندانە ومردن بەخشی هەبێت،بەرامبەر ئەو کەسەی کە هاوبەشی بۆچونەکانی ناکات بێ کەڵکە تەنها خۆی ببەستێتەوە بە خەبات دژی بیر وباوەڕی دوژمنەکانی، بەبێ ئەوەی کەخەبات دەکرێ دژی، هەرلەخۆیەوە نایەتە کایەوە بەڵکو بەرجەستەی ئەو تاکە دەکات و لەبەر ئەوەی دەبێ لەناو ببرێ وبۆ ئەوەی بیروباوەڕەکەشی نەهێنێ.

هیتلەر دەیگوت:_کاتێك بیرکردنەوە ئەقڵ بێدەنگ دەبێ دوابڕیار دەگەڕێتەوە بۆ توندوتیژی وهێرش بردن،باشترین چەکە بۆ بەرگریکردن لەخۆ چ لە یەکچونێکی سەرسوڕهێنەرە !چ باوەڕێکی ڕەها بە خۆ!چ باوەڕێکی بەزەبر وزەنگ!.

میشیل عەفلەق دەڵێ:_نەتەوە دەتوانێ خۆی بەدی بێنێ دەتوانێ ئامانجی خۆی بپێکێ لەڕێگەی بەرەنگاربونەوە بەتایبەتی کاتێ کە ئەم بەرەنگاریە کارەکتەری جدی وەردەگرێت و هەموو چرکەیەك بەرامبەر مەرگ

دەوەستێتەوە،بەرامبەر مەرگ نائومێدی ناچالاکی سەدەیی نامێنن وجەهالەت وخۆپەرستی دەسڕێنەوە ئەو پیاوەی کە بەرەنگاری مەرگ دەبێتەوە پیاوێکی ڕاستەقینەیە ئەو پیاوەی کە لەکاتی مردنیدا وئەو پیاوەی کە ئامادەیە ژیانی خۆی بەختبکات هەست بەبێ کەڵکی ئەو هێزانە دەکات کە بەندیان کردووە کە بەستویانەتەوە ژیانی بەعسیەك زۆر زیاتر دەوڵەمەند دەبێ وەسێتەکەی بەهێزتر وفراوانتر دەبێ ئەگەر ئامادە بێ تەجاوزی خۆی بکات،مرۆڤی پاڵەوان ئەوەیە کە وزەی ژینداری لێ دەڕژێت وخۆی بەختبکات.

هیتلەر دەیگوت ناسیۆنالی سۆسیالیزم عەقیدەی بەختەوەری شانسی باشی نییە بەڵکە عەقیدەی ئیش وخەباتە وە هەروەها عەقیدەی خۆبەختکردنە((ئەفسانەی پاڵەوانێتی کە پێکهاتبوو بەخستنەکاری سیاسەتێکی دڕندانە دەنگی لەناو ئەو بۆچونە دەدایەوە باوەڕ هێنان..خەبات بەرنگاری کردن پاڵەوانی خۆبەختکردن کە ناسیۆنالیزم وسۆسیالیزم وفاشیزم وبەعس داوای دەکەن.

بەعسێکان دەیانگوت:_باوەڕم بە بەعس هێنا وەك خوایەکی بێ شەریك وعروبەش وەك ئاینێکی بێ هاوتا یان بەعس ئاینمە وعەرەبایەتیش ئاینزا.

# بەعسیزم ودەوڵەتی بەعس

بەعس بریتیە لەدامەزراندنی دەوڵەتێکی ناسیۆنال لەسەر بنچینەی ڕابردوو ئەمەش لەسەر بناغەی خواستێکی یۆتۆپی کە لەڕاستیدا لەدۆخێکی جیۆپۆلۆتیکی وێکچو لەگەڵ ناسیۆنال سۆسیالیزم بۆ ئایدیۆلۆژیای بەعس..لەبەر ئەوەی پێوانەی یەکێتی ناسیۆنال پشتی دەبەست بەگەڕانەوە بۆ ڕابردوو وگەڕان بەشوێن یەکبونێك،کە بنچینەی زمان وکولتور ورەگەز بوو.ناسیۆنالی سۆسیالیزم دەیویست ڕایخی هەزارساڵ دابمەزرێنێ،ئەمەش ئیمپراتۆریەتێك بوو بۆ دەست بەسەراگرتنی هەموو ئەوروپا لە ئۆقیانوسەوە بۆ ئۆرال..بەعسیش دەیویست نیشتمانێك دابمەزرێنێت نوێنەرایەتی هەموو عەرەب بکات..عروبەش هەمیشە دەیوتەوە..(من المحیگ الی الخلیج)ئەمەش خواستی هەردووکیان بوو.

تیۆرەی دامەزراندنی دەوڵەتی بەعس هاوشێوە لەگەڵ خواستی هیتلەر لەم چەند خاڵەی خوارەوە پێکدێت.

١-عەرەب لەبارودوخێکی داغان وتێکچو دەژی ئەمەش لەئەنجامی هەرەسی ڕۆحی ڕەسەنی عەرەب.

٢-پێویسته ئەم ڕۆحە زیندو بکرێتەوە..بۆ ئەم مەبەستە پێویسته دەوڵەت بەشێوەیەکی بەهێز وکاریگەر ببەسترێن بە نەتەوە بەشێوەیەك کە دەوڵت لەباوەشی نەتەوە خۆی بدۆزێتەوە.

٣-ئەم یەك بەستنەوەش نایەتە دی ئەگەر لکاندنی نەتەوە بە حزبەوە نەبێ و هەموو هێزێکی دیموکراسی بخرێتە دەرەوەی ئەم موعادەلە لەکاتێ عەفلەق کە نەخۆشی پەیوەندی نەتەوەی عەرەب دەبێتەوە تیشك دەخاتە سەر کە نەخۆشی نەتەوەی عەرەب بریتیە لە نەتەوەی عەرەب خۆی لەخۆیدا.

بەعس هەمیشە لەچارەکردنی دەوڵەتی نەتەوەی چارەسەر بکرێت ئەوان پێیان وابوو کە نەتەوە بونی هەیە کێشە لە چارەسەرکردنە کێشەی بەعس بەدوای چارەسەری نەخۆشی نەتەوەدا دەگەڕێ کە نەتەوە توشی ئازار بوە.

هیتلەریش بەهمان شێوە دەیوت هەرەسهێنانی ئیمپراتۆریەتی ئەڵمان ئەوەندە قوڵە کە لەوە دەکات هەمووکەسێك توشی کوێرەوەری وبێ هەستی وبێ عەقڵی بوبێت کەس بە شێوەیەکی تەواو مەزنی ڕابردووی لەبیر نەماوە ئەو هێزە جوانییەی جاران وەك خەوێك دێتە پێش چاو کاتێك بەو هەژاریە زۆرەی ئەمڕۆ بەراورد دەکرێ،عەفلەق پێ وایە هۆی ئەم تێکچونە دەگەڕێتەوە

سەر هەرەسهێنانی ئەو ڕۆحەی کە جاران پاڵی بە عەرەبەوە دەنا یەککگرتو بن ئەمەش ئەنجامی کاڵبونەوەی ڕۆحی عەرەبییە.

عەفلەق پێ وایە دەبێ پەیامی نەمری عەرەب پێش هەموشتێك پێکهاتوە لە عەرەب واتای ئەم باوەڕە ئەوەیە کە یەکێتی عەرەب دەبێ بنیاتبنرێتەوە نەك لەڕوی سیاسیەوە بەڵکو لەڕوی ڕۆحیشەوە، مەبەست گەڕانەوەی ڕەچەڵەك ورەگەز لەو یەکێتیە وداهاتوش پاڵیان پێوە دەنێ کەڕۆحی ڕەسەنایەتی بێتە دی.لێرەشدا عەفلەق دێ گەورەترین کێشە چارەسەر دەکات ئەویش ئیسلامە،لای عەفلەق ئیسلام نوێنەرایەتی ڕۆحی عەرەب دەکات گوزارشت لەپەیامی ناسیۆنالیستیەکەی دەکات عەفلەق دەست بۆ ئەو سەردەمە دەبات کە کشان وپاڵەپەستۆی دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی تیایدا ڕەگەزی عەرەب خۆی دەسەپاند وزۆر میلەتی جیاجیا لەناو بۆتەقەی عەرەب توانەوە یاخود بۆ سەردەمی پەیامبەر وچوارخولیفەی ڕاشدین وئەمەویەکان وئەو بنەماڵانەی کەدوابەدوای ئەو دا هاتن بەتایبەتی پاش ساڵی٧٥٠:ئەمەش جۆرێکە لە داستان خوڵقاندنی عەفلەق بۆ نەتەوەی عەرەب.

گومانی تیادا نییە کە ئاینی ئیسلام دەکەوێتە نێوان مێژوی عەرەب وسەردەمی جاهیلی وسەردەمی فتوحات..ئەمەش

لەڕێگەی پەیامبەرەوە توانرا لەماوەیەکی بەرچاودا دەسەڵاتی خۆیان بەسەر زۆرێك لەگەلانی جیهانی بسەپێنن لەماوەی کەمتر لەسەدەو نیوێك توانیان زۆر میلەت بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە..تورك،فارس،کورد بەربەر وهتد...لەسەردەمی خەلیفەی ڕاشدیندا٦٥٦-٦٣٢:عەرەب وسوریە ومیزوپۆتامیا ولآتی فارس وکوردستان ومیسر ولیبیان داگیر کرد ئەمجار لەژێر دەسەڵاتی ئەمەویەکاندا٧٥٠-٦٦١گەیشتنە هیند وئاسیای بچوك وئەفریقیای ژور وئەسپانیا...ئەمەش کاتێکی کورتی خایاند وەك عەفلەق دەڵێ لەگەڵ کەوتنی ئەمەویەکان لەساڵی٧٥٠داگەیشتە کۆتای.

ڕوداوی بنەماڵەی عەباسێکان سەرەتایەك پڕ لەپرۆسەی دورودرێژی هەرەسهێنانی خستنەڕوەوە ، هەژمونی ئێلێمێنتی عەرەب وردەوردە دەستی کرد بە پاشەکشە وگەڕانە دواوە گۆشەیەکی بەتاڵ کرد بۆ پێکەوە ژیانی ئیتنیە جۆراوجۆرەکان،ئەگەر لەبارەی کولتوری وکۆمەلآیەتی وئابوریەوە عەباسێکان توانیبێتیان بگەنە لوتکەی درەوشانەوە وپەرەسەندن لەسەر ئاستی سیاسیدا هێزی پاڵپێونەری خەلیفە نوێکان وردەوردە ڕویکردە سیس بونەوە نەیاتوانی کۆنترۆڵێکی ڕاستەوخۆ بەسەر خەلیفەکانی کۆردۆڤا ومەغریب وتورکیە

وئیسپانیا هەتا دوایی بکەن.بە پێچەوانەی ئەمەویەکان کە سیاسەتێکی ڕقیان پەیڕەو دەکرد.

عەباسێکان لەڕێگەی فارسەکانەوە دەسەڵاتیان گرتە دەست وردە وردە دەستیان کردبوو بە ونکردنی ئێژیۆنی ولەدەست نەمانی دەسەڵات کاریگەری کولتوری فارسی خۆی بەسەر ژیانی سیاسی عەرەبەکاندا سەپاندبوو ژیانی ڕۆشنبیری وکولتوری لەپاڵ چوارچیچوەیەکی عەرەبیەوە زۆر لایەنی ژیانی فارسی وئاشوری کلدانی وهند وهتد..دوای دەگرتەوە.

بەهاتنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ سەر دەسەڵات لەسەدەیی چواردەهەمدا چەرخی عەباسێکان کوژایەوە وسەرەڕای چەند قۆناغێکی کەوتن ولاوازی،عوسمانێکان توانیان سەرکەوتن بەدیبێنن وکۆتایی بەمەزنی گروپێکی ئیتنیکی بهێنن کە چەند سەدەیەك لەوەپێش ئەکتەری بێ هاوتای مێژوی جیهانی ئەوسابون، ئەم ڕوداوە تەنها هەرسهێنانی تەواوی دەسەڵاتی عەرەب وملکەچیان بۆ هێزێك بێگانە مۆر نەکرد بەڵکو زۆر ئیتنی پێکەوە تێکەڵاو کرد وکوتلەیەکی سوسیۆلۆژی دروست کرد کە عەرەب لەناویدا هەرچەندە زۆربوو بەڵام تەنها بەشێکی پێکدەهێنا،ئیدی نابێ ئەوە لەبیر بکرێ کە ئەم مێژوە

بەشێوەیەك هاوبەشی دەكات لـە چوارچێوەی مێژوی وەك كۆی چەند ڕوداوێك كە تەواو بوە لەكتێبەكانی مێژو دەخوێنرێ.

بـا لێـرەوە بـزانین بۆچـی عەفلـەق داوایـی ژیانـەوەی ڕۆحـی عەرەبی دەكات.

كاتێ عەفلەق بەتایبـەتی صـدام حـسێن سـەرنجمان سـەبارەت بەئیسلام وەك دیاردەیەكی ناسیۆنالیست ڕادەكێشن ئەوان پەنجە بۆفتوحاتی بێ هاوتای عەرەب ڕادكێشن واتـە ئەوسـەردەمەی كـە عـەرەب دەرپەڕا،وبردینیـە دەرەوەی دورگـەی عـەرەب وكردنـی بەخاوەن چەند ناوچەیەك دەسەڵاتیان فراوان كرد .

لەوكاتەوە وەك عەفلەق دەڵێ:(غرقـوا فى تلـك اللجـه المتباينـه المتماوجه من الشهوب)

هـەرووەها ونكردنـی (تجـانس القـومی )دەسـتی پـێ كـردو لەوكاتانەی كـە عـەرەب لـە دەریاییـەكی بـێ سنور لـەناو گـەلانی بێگانەی جیاوازدا نوقوم بون .

هیتلـەریش دەیگـوت:تێكـەڵبونی خـوێنی ڕەگـەزی ئـاری بـە میلەتانی نزم ئاكارەكەی ئەم شتانەی خوارەوە بوو.

نزمبونەوەی ئاستی ڕەگـەزی بـەرز گەڕانـەوە دواوەی فیزیكـی وڕۆشـــنبیری لەئەنجامـــدا دەركـــەوتنی جۆرێـــك لەدیـــدەی دواكەوتوو..ڕەگـەزی ئـاری وازی لـەپوختی خـۆێنی هێنـاو بـەهۆی

تێکەڵبونی چەند ڕەگەزێك توانا شارستانیەتەکانی ونکرد..ئەمەش نــەك تــەنها لەســەر ئاســتی ڕۆشــنبیری بــەڵکو لەســەر ئاســتی فیزیکیش،بەم شێوەیە ئەوپلەبەرزەی ونکرد کە باوباپیرانی هەیبو بەسەریا.

عەفلـەق دەڵـێ:_نـەمانی یـەکێتی عـەرەب مرۆڤـی عـەرەبی گەڕایەوە تەنیایی ونائومێدی بۆچی؟چونکە ئەوپەیوەندیە ژیاوەی کەمرۆڤ بەکۆیەکی ژیـاو دەبەسـتێ لەسـەردەمی لاوازی بێگانـەکان وپارچەپارچە بونی کیانی عەرەبیدا ونبوە.

کاتێ دەڵێین:ناسیۆنالیزم ڕاستیەکی ژیـاو ونـەمرە،دان بـەوەدا دەنرێ کەناسیۆنالیزم واتـە ئەوشـێوەی بـەعس لەجۆڵانەوەیـەکی بەردەوام وهەمیشە دایە،ئەکری ئەم تێڕوانینە باوەڕکردنـە بـەوەی کەمێـژوو بەلایـەنی کەمـەوە کەمێـژووی عـەرەب بـەلای بەعـسەوە پێکهاتوە لەپرۆسەیەکی نەپچڕاو لەبەرز ڕاگرتنی بیرۆکەی نەتـەوە چـونکە ئـەوە واتـای هەیـە وئەوەدەگەیـەنێ کـە ناسـیۆنالیزم دیاردەیەکە کەهـەبوە وهەیە لەداهاتوشـدا هـەردەبێ بـە ئەبـەدی کردنــی ناســیۆنالیزم ، بــەعس ڕاســتەوخۆ دان بــەوەدا دەنــێ کەناســیۆنالیزم بریتیــە لــەهێزی داهــاتوی گــەردونی..مێــژوو گوزارشتی سیستماتیك ونەمری هەموکۆمەڵێکە کۆمـەڵێك نـەتوانێ دروست ببێ ولەسەر شێوەی دوڵـەت بەڕاسـتی دەق بگـرێ ئەگـەر

لەلایەن ناسیۆنالیزمەوە نوێنەرایەتی نەکرێ،چونکە ناسیۆنالیزم لەلایەن هیچ پرەنسیپێکی دەرکیەوە سنوری بۆ دانەنراوە وێنە ورەنگدانەوەی گیانێکی نەگۆڕاوە کەپێ دەوترێ نەتەویە..چونکە ناسیونالیزم بەستراوە بەئەزمونێکی بونەوە بون بەمانا ئەنتۆلۆژێکەی کە تەجمیدکردنی وگەورەکردنەوەی پەیوەندی بونێکی ڕابردوو ئێستاو داهاتوە ، بەلای عەفلەق وهیتلەر وهاوشێوەکانیان دەوڵەت دەبێ ببێ بەمحتوایی نەتەوە یارەگەز دوهەم دەبێ ببێ بەئامرازێك کە لەخزمەتکردنی چاککردنی نەتەوە یارەگەزبێت.

لەڕوانگەی ناسیۆنالیزمی بەعسەوە،شوێنی تاك لەسەر بناغەی کەڵکی بۆکۆی نەتەوایەتی دەپێوری لەوکاتەوەی کەسنورە دادوەریەکان لەنێوان دەوڵەت نەتەوە دادەمرکێنێ وبەشێوەیەکی تەواو یەکەمیان ملکەچ پێ دەکات بۆ دوهەم.

ناسیۆنالیزمی بەعس نایەوێ دۆخی تاك لەسەر بنچینەیەك ئەوپێناسە دادوەریە وێنا بکات کەسنور بۆئەرك ومافی هاوبەشی دادەنێ بەمشێوەیە تاك ملکەچ پێ دەکات بۆ حوکمێکی ئیتیکی کەنەتەوە پێ دەبەخشێ کەئەمە چ ئەنجامێکی لۆژێکی؟ئەم پەیوەندیە بابەتی وگەردونیانەی کەماف لەنێوان کیانە فەردی وکۆیەکاندا دایدەنێ دەگۆڕێن ودەبن بەپەیوەندیەکی شەخسی

لەگەڵ نەتەوە ڕادەی وەفـایی ودڵسۆزی خۆبەسـتنەوەی چالاکی بەنەتەوە،دەبێ بە تەنها پێوانە بۆکەڵکی مرۆڤ هاولاتی.

بـەم شـێوەیە پەیوەنـدی سیاسـی تـاك بـە کیـانی ئیتنیکـی کەبریتیـە لەنەتـەوە جـێ ئەوپەیوەندیانـە دەگرێتـەوە کـەمرۆڤ دەبەستنەوە بەوئۆرگانیزمە دادوەریەی کەدەوڵەتـە..بـەلام ئەگـەر نەتـەوە بەسـەرۆکەوە بلکێنـرێ یـان لەرێگـەی سـەرۆکەوە پێناسـەبکرێ ئـەم پەیوەندیـە دەگـۆڕێنێ دەبـن بـە بنـچینەی ملکەچی بێ مەرج بۆ وسیتی ڕەهای سەرۆك .

بە زمانی بەعسەوە میـشیل عەفلـەق دەڵـێ:_ئێمـە بەرهـەمی نەتەوەکەمانین دەبێ هەمیشە باوەڕمان کـەکردەوەی بیرکردنـەوە وتوانامان بۆجێ بـەجێکردنی شتێك لـە ناوخۆمانـدا لـە ناوکومـەڵ هیچ شتێك نییە تەنانەت دەنگدانەوەیەکی بـێ ڕەنـگ وڕاسـتیەکی کـەم وکـورتی نـە بـێ..ئەگـەر بـەراورد بکـرێ بەڕاسـتی نەتـەوە هەمیشەییەکەمان .

بەعس جەخت دەخاتە سەرئەوەی کە نەتەوە ((ئۆرگـانیزمێکی ژیاوە کـە ئەندامـەکانی بەسـتراونەتەوە بـە یەکـەوە هۆشـیاریەکی جەستەیی وجیاکردنەوەی ئەندامەکانی دەبێتـە هـۆی مردنـی ئـەو پەیوەندییـەی کـەمرۆڤ دەبەسـتێ بـە نەتـەوە پەیوندیـەکی ئۆرگانێکـە،تاك هـیچ واتایـەکی یـان بەهایـەکی نییـە ئەگـەر

سەربەخۆبێت لەنەتەوەو نەتوانی پڕی ئامانجی خۆی بە بێ ئەوەی ئەندام نەبێت.

ئەگەر تاك بێ هەست بێ بەرامبەر ڕەگی نەتەوایەتی ژیانێكی بێ بەرهەم دەباتەسەر.

## ڕوانگەی ناسیۆنالیزمی بەعس بۆ ئیسلام

لەڕەوانگەی بەعسەوە ئیسلام پێش هەمو شتێك بزوتنەوەیەكی ڕۆحی عەرەب دەنوێنێ،واتە ڕەنگدانەوەی ڕۆحی عەرەبە، بزوتنەوەی ئیسلام كە خۆی لەژیانی پەیامبەری پیرۆز دەنوێنێ تەنها ڕوداوێكی مێژوی نییە بۆ عەرەب كە باسی كات وشوێن بكات لەناوچوار چێوەی هوكارو ئاكامەكانی بەڵكو پەیوەندیەكی ڕاستەوخۆ هەیە بەژیانی گشتی عەرەب لەقولای توندوتیژی وبلاوبونەوەیاندا..واتاوێنەیەكی ڕاستەقینە وسومبولێكی تەواو نەمری سروشتی سایكۆلۆژیەتی عەرەبە،ئەگەر بزوتنەوەی ئیسلام پاڵەپەستۆیەك كەهەوڵی داوە بۆگۆڕینی ژیانی عەرەبی ئەی دژی چی ودژی كێ كاری كردوە؟دژی بارودۆخی میلەتی عەرەب ودژی سیستمی جیهانبینیان؟باشە ئەم باردۆخە چۆن چۆن بوو؟ئایە

بارووداوخێك بوو كەگوزارشتی لەژیانی بتپەرستی دەكرد یاخود واقعییەكی بوو كەپێكهاتبوو لەپێشبڕكی ململانێ ناكۆكی نێوان هۆزە عەرەبەكاندا؟ لەوماوانەی بەدوای فتوحاتی پەیامبەردا هاتنی ئیسلام چی بوو ڕاپەرینێك بوو دژی ناعەدالەتی و زەبروزەنگ؟ئەی چی بوترێ سەبارەت بە فتوحاتی چوار خەلیفەی ڕاشدین؟ئیمپراتۆریەتی عباس وئەمەوی؟ئەوەی سەیرە بەعس ئیسلام شیناكاتەوە تەنها وەك وێنەیەكی ئیحتجاج پێشكەش دەكات ودەیكاتە ئامرازێك یان داردەستێك لەپێناوی ڕاگەیاندنی بان عەرەبیەت وناسیۆنالیزمی خۆی ، بەم شێوەیە ئیسلام بۆ بەعس دەبێ دیاردەیەكی كەپەیوەندی ڕاستەوخۆی بەژیانی ڕەهای عەرەبەوە هەیە..وێنەیەكی ڕاستەقینە وسیمبۆلێكی تەواو نەمرە وبۆسروشتی سایكۆلۆژیەتی عەرەب وتوانای دەوڵەمەند وڕەهەندی ڕەسەنی((ئیسلام جوڵەیەكی ژیاوە كەسەرجەم هیزە شاراوەكانی نەتەوەی عەرەب دەجوڵێنێتەوە..و ئەزمونێكی ئیتنیكی مەزنە كە لەرێگەیەوە عەرەب زانیان چۆن ڕاپەرین دژی دۆخەكەیان و بەرەنگاری خۆیان ببنەوە..بوئەوەی بگەنە یەكێتیەكی بەرزتر،لەم هەڵوێستەی كەئیسلام پێشكەش دەكات وەك كەسێكی عەرەب ویەكێتیەكی بەرزتر..وەبەرپەرچ دانەوەیەك دژی واقعی ئایدۆلۆژیای بەعس فتوحات ئیسلامی

دەكات بەبیانویەكی بۆشانازی كردن بەرابردوە عەرەب دەكات بەهەلگری ئالای شارستانیەت وەپێشكەوتن كە بە وتەی عەقلەق هەرچەندە زۆر دەوامی نەكردوە بە دیهاتنێكی مادی وجوزئی تەسك بوو،ئەگەر بەراورد بكرێ بەو خەوە مەزنەی دەیان ویست بەدی بێنین.

هەمو ئەو شتانە كە ئیسلام لەبیست سالی یەكەمی پەیامبەریدا بەرهەمی هێنا لەداگیركاری وشارستانیەت لەدۆخی نوێی سەرتایدا بوو،بەرلەوەی عەرەب زەوی داگیربكەن ناخی خۆیان ئازادكردوو رۆچۆن بەقولایی ناخیاندا شارەزایی كرۆك ناخی خۆیان بون.بەرلەوەی دەسەلات بەسەر میلەتانی تر رابگرن دەسەلاتیان بەسەر خۆیاندا گرت وخۆیان كۆنترۆل كردوو بونەخاوەنی شوناسی خۆیان..ئەوزانستانەی كە بونیادیان ناو ئەوهۆزانەی دایان هێناو ئەوتەلارسایەی كە بەرزیان كردەوە شتێك نەبوو جگە لە بەدیهانێكی خەونێكی بەهێزو گشتگیر نەدەشكرا كە لەوەسالانەدا بەهەمو هەستیانەوە ئاواتیان پێ دەخواست دەنگدانەوەیەكی كزی ئەو دەنگە ئاسمانییە بوو كەبیستویانە سێبەرێكی لێلی ئەوخەونە جادوگەرە بوو كە لەرۆژگارێكدا بینیویان فریشتەكان لەرێزی ئەواندا بوون وبەهەشتیش لەسەر

نـوكی شمـشێرەكانیان دەدرەوشـانەوە.((داسـتانی ئیـسلامی جیاناكرێتـەوە لەپێگـە سروشـتێكەی كەبریتیـە لـەخاكی عـەرەب وپاڵەوان وئەكتەرەكانی كەهەمویان عەرەب بون.

عەرەب بۆخۆی پاڵەوانەی عەربێكەی هەلبژارد..خـودا عـەرەبی هەلبژارد بۆبلاوكردنەوەی پەیامی ئیسلام چونكە خـاوەنی سـیفات وچـاكەی سـەرەكی بـوون وهـەروەها سـەردەمێكی هەڵبـژارد بـۆ دەركەوتنی ئیسلام چونكە كە عەرەب تیایدا گەیـشتبونە ڕادەیـەك لەپێگەیشتن وكاملبون بۆ وەرگـرتنی ئـەو پەیامـە وبلاوكردنـەوەی لەنێوان خەڵكیدا ئیسلام نـەك تـەنها بزوتنەوەیـەكی عـەرەبی بـوو بـەڵكو نوێنەرایـەتی نوێكردنـەوە وتـەواوكردنی عـەرەبی بـوو ڕەنگدانەوەی واقع عەقڵی عەرەبی بوو ئەوفەزیلەتەی لەپتـەوكردن پێكهاتبون لەفەزیلەشاراوەو دەركەوتوەكانی عەرەب.

صدام حسێن دەڵێ:_لەكاتێكا باسی موحەمەدی مەزن دەكەین دەبـێ وەك پەیامبـەرێكی مرۆڤایـەتی وپالـەوانێكی ناسیۆنالـستی گـەورەی نەتـەوەی عـەرەب سـەیری بكـەین چـونكە كەسـانی گـەورەی وەك پەیامبـەر لەباوەشـی نەتەوەیـەكی گـەورە لـەدایك دەبن.

هەرئـــــەم شـــۆڤینییەت وســـەلەفیەتەوایی لەســـــەدام ودارودەستەکەی کرد کەخـەونێکی ئەفسانەیی نەتـەوەیی وئـاینی لەسەر ئاستی عێراق وناوچەکە بەرپا کردوو بەدوایی ئەم وەهمـەدا چەندین جەنگ وکوشتاری گەورەیان بـەرپا کـرد یـەکێ لەوجەنگـە نەتەوەیانە شەڕی دژی کورد وجینۆساید کردنی بوو.

# بەشی پێنجەم

- هەڵەو ستراتیژو پشکی بزوتنەوەی سیاسیو چەکداری کورد لە جینۆسایدکردنی نەتەوەی کورد
- هێزی پەلامارده‌ری ئێرانو بزوتنەوەی چەکداری کوردی

# هەڵەو ستراتیژو پشکی بزوتنەوەی سیاسیو چەکداری کورد لە جینۆسایدکردنی نەتەوەی کورد

بزوتنەوەی بەناو سیاسی کورد یان باشتر بڵێین بزوتنەوەی ناسیۆنالستی کورد بەدرێژاییو سەرهەڵدانی بزوتنەوەیەکی خێڵەکی ومەلا شێخ وبەگەکان بوە، هەمیشە بەدوو ئاراستە کاری کردوە..ئاراستەیەك بەرگریکردن وئاراستەیەك سەرلێشێوان وپاڕانەوە لەسیستمە هەرێمایەتی وزلهێزەکان بووە بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندیە تایبەتێکانی حزب ودەستە وتاقم کە بەرژەوەندی فعلیان هەبوە لەپێناوی خزمەتکردن بەبەرژەوەندێکانی خێڵ وبنەماڵە تادەگاتە دوایی ڕاپەڕینی بەهاری ۹۱ی کوردستان...لەم مەیدانەشدا ئەوەی پێ یان کرابێ بەهۆی ساویلکەی ئاستی سیاسی چەند کەسانێك هەمیشە یەکێك بونە لەفاکتەرەکانی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆی هەرچی کارەسات و ڕوداوە پێچەوانەکانی خواستەکانی گەلی کورد.بۆیە تائەمڕۆش دەبینین ئەوتوێژەی کە سەرخانی سیاسی نەتەوەی بندەستن توێژێکن دوور لەهەمو عورف وعادەتێکی سیاسی..بەڵکو بگرە تائەمڕۆ لەجەوهەری ڕۆحی فیۆداڵی ودیوەخان دەرباز

نەبون...بەدرێژایی مێژوی سیاسی عێراق ئەم بزوتنەوەیە لەبەر ناکامڵی ونەزانین بۆسیاسەت نەیتوانیوە خواستی نەتەوە بباتە دەرەوەی حزب وخێڵ کەئەمەش بۆخۆی خوێندنەوەیەکی سایکۆلۆژی دەوێ لەسەر ئاستە جیاوازەکان بۆکەشف وناسینی کەسایەتی سیاسی کوردی.

لەم ساڵانەی دوایشدا ماهیەتی هەمو ئەو بزوتنەوانە دەرکەوتن کە تاچی ئاستێك لەئاست چەمك وزاراوەکان فەقیر وهەژاران لەدەرئەنجامی پەیڕەوکردنی خێڵ وبەرژەوەندیکان وسیاسەتێکی کلاسیکی پڕبەپێستی بزوتنەوەی کوردی تا ئێستا درێژەی هەیە...

لەم بوارەشا ئەم بزوتنەوەیە بەڕوی جیهاندا داخراوە وهیچ پەیوەندیەکی زانستی بەدونیای دەرەوە نیە...ئەمەش هۆیەکیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوبارودۆخەی کورد تیای دەژی ، هۆکەی تریش دەگەڕێتەوە بۆ جەوهەری بزوتنەوەکە کەبزوتنەوەیەکی حزبی وخێڵەکی تەسکە لەئاست تازەبونەوە کرانەوەدا نیە، کەسیستمی عەقڵی ئەم بزوتنەوانە سیستمێکی ئیفلیج وگەمژانەیە ، باشترین بەڵگەش بۆم هەلومەرجە نەزانی وهەژاری سەرانی کوردە بەرامبەر بەرِوداوە نێودەوڵەتی هەرێمایەتێکان..میلەتی بندەستیش میلەتێکە هەمیشە بڕوایی بەخۆی نیە توانای بەرانگاری

داگیرکـــەری لەئاســـتی ســـەرکزیو شـــەرم وحەماقـــەتێکی گەورەدایە...کەچی لەناوەوە بۆگیانی یەکتر بچوکترین دەرفەت بۆفرۆفێڵەکانی یەك نامێڵنەوە بەوپەڕی زیرەکیەوە لەبۆسەدان توانای هەڵوەشانەوەی هەمو پیلانێکی یەکتریان هەیە..بەڵام بۆداگیرکەر سەرانی کوردی هەمیشە لەجەوهەری سیفەتی موجامەلەی نا سیاسیو بێ دەنگی شەرم ومیوانداری بترازێ هیچی دیکە نین،کاتێکیش بەرەنگاری گەیشتوەتە ئاستی لەناوچونی ئەم حزبانە ئەوەی ناشیرین بێ ودوورلە سیاسەت کردویانە تەنانەت زۆرجاریش ڕێگای خیانەت ومساومە وخۆکوژیان گرتوەتەبەر کەئەمەش لەمێژوی بزوتنەوەی کوردیدا پڕخەجاڵەت بارەو بزوتنەوەی کوردی ڕۆژگارێکی دورودرێژی لەگەڵدا هەیە...

سەدەی بیست تاقیکردنەوەیەکی گەورەبوو کە لەقۆناغی بەرگریدا سەرخانی خێڵەکی سیاسی کوردی ڕوبەڕوی بوەوە،لەم سەدەیەشدا بزوتنەوەی کوردی تا بینەقاقای یەکێ بوە لەوفاکتەرە سیاسیانەی کە هەمیشە مەینەتی وتراژیدیای هێناوەتە کایەوە،هەندێ جار سیاسەتی هەڵە..نەزانین تەواوکەری ئەو پیلانە بوە کەدوژمن نەخشەی بۆکێشاوە،لێرەدا مەبەستی من تراژیدیای ئەنفال و هەڵەبجەیە...ئاخۆ بەس تەنها صدام حسێن لێی بەرپرسیار بوو یان بزوتنەوەی چەکداری کوردی خۆی بەشێك

بون لەتاوانەکە...مێژو ئەوەمان پێ دەڵێ کەسەرانی بزوتنەوەی کورد ناڕاستەوخۆو ڕاستەوخۆ بەژداریەکی فعلی کارەساتەکانی هەڵەبجە وئەنفال بون..کە لەڕێگەی دیکۆمێنتەکانەوە ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە سیاسەت وستراتیژی هەڵەی کوردی دەیان گۆڕستانی بێ ناونیشانی کردە بەشی نەتەوەیەك کەهێشتاش چاوەڕوانی تراژیدیای دیکەین.

من بۆخۆم وەك پ.م.لەخەباتی چەکداری لەسەردەمی شاخ لەناو ڕوداوەکان بوم لەنزیکەوە ئاگامان لەو ڕوداوانە بوو کە پێشبڕکێ بزوتنەوەی کوردی وەك چەکداری لەشکرێکی بێکانە بەمانای وشە ڕەنگی دایەوە وتائەمڕۆش سەرانی کورد بەردەوامن لەخزمەتکردنی داگیرکەرانی کوردستان ناڕاستەوخۆ بە ئەنقەستو ناچار لەڕێگەی ئەو فایل ودیکۆمێنێتانەوە ڕوژانە مێژوی ڕەش هەڵدەداتەوە بۆمان دەردەکەوێ ئەم بزوتنەوەیە سەرانسەری حزبە چەپ وناسیۆنالستەکان هەمیشە سەر بەلایەن وئەجندایەکی سیاسیو نهێنی بون وکوردیش هەمیشە قوربانی دەستی ئەو نەخشە وپلانانە بوە کەتا ئەمڕۆ سەرانی کوردی ئەو مێژوە خەجاڵەتبارەیان بەوپەڕی شەرمنییەوە ئەنجام دەدەن ولەدواڕۆژیدا شیرینیو پارەی ئەو کارەش وەرناگرن کە کاری بۆدەکەن ، لەدونیادا بگەڕێ حزب ونەتەوەیەك نابینی بەئەندازەی

حزبی کوردیو تاکی کوردی بێ باك بوبێ لە ڕوداوەکانی ڕابردوو، باشترین نمونەش زنجیرە خەتا وهەڵەگەورەکانی بزوتنەوەی کوردیە بەدرێژای هەفتا ساڵ وئەو زنجیرە تاوانانەی بەدەستی کورد خۆی پێشکەش بە دوژمنانی کردوە بەوپەڕی شانازیشەوە کردویەتیە مێژوی پڕشانازییەکانی خۆیو گەمژانەش باس لە سەروەری دەکات..

هیچ حزبێك لەدونیادا بەئەندازەی حزبی کوردی وبێ باك مساومەی قبوڵ نەکردوە..مێژوی حزبی چەپ وناسیۆنالستی کوردی بریتیە لەزنجیرەیەك هەڵەو خزمەتکاری ناڕاستەوخۆی داگیرکەر وبەرهەمی تراژیدیا گەورەکانی نەتەوەی کوردە...باشترین بەڵگەش دەستپێکی تراژیدیا گەرەکانی کورد ئەنفال وهەڵەبجەبوو..

ئێستاش لەم چەند لاپەڕەیەدا پشکی ناڕاستەوخۆی کارەساتی ئەنفال لەسەر دەستی هێزە کوردییەکان بە سودوەرگرتن لەداگیرکەر دەخەینە سەر لاپەڕەکانی مێژو کەپێش منیش زۆری لەسەر وتراوە وتەواو نابێ.

بەدرێژای کانونی دووەم وشوباتی١٩٨٨..شپرزەیەك کەوتە نێو ڕاپۆرتەکانی هەواڵگرییەوە کەوا لەئەمنی سلێمانی فەیلەقی یەکەوە دەردەچون ئاگاداری ئەوەیان دەردەبڕی کەوا کارێکی

هاوبەش لەگۆڕێدایە لەلایەن حزبە کوردیەکانەوە لەگەڵ ڕژێمی داگیرکەری ئێران نەخشەی بۆکێشراوە ، بەگوێرەی بۆچونی دەزگا ئەمنیەکانی بەعس گاردی شۆڕشی ئێران لەبنکەکانی حزب ولایەنە کوردێکان کاری خۆیان ئەنجام دەدەن...ئەرکی سەرپەرشتی وچاودێری جێبەجێدەکەن مەبەستیشیان شاروچکەی هەڵەبجە وشاری کەرکوکە ، لێرەشدا دەقی ئەو ڕێکەوتنە دەخەینە بەرباس وتەواوی پیلانەکە بلاو دەکەینەوە.

لەهەشتەمین ساڵی جەنگی عێراق_ئێران هەرچی وزە وتواناکان بوو خرانەکار،کوژرانی سەدان هەزار ئینسان بەفیڕۆدانی میلیارەها دۆلار حەزە سەرشێتەکانی ڕژێمی بەعس و....بانگەوازەکانی هەناردی شۆڕش وەماوەیەکی زۆر هێزەکانی هەردوولا لەکوشتاری گەورەدا لەسەر سنوری ئەم دوو وڵاتە درێژەی کێشا بۆ یەکلایکردنەوەی شەڕ وگۆڕینی پارسەنگی جەنگ.ئێران بەحوکمی بالادەستی دیمۆگرافی زۆری ژمارەی دانیشتوانەکەیەوە بیر لەفراوانکردنی بەرەی شەڕ بکاتەوە وسەرکەوتنێکی سەربازی تۆمار بکات.گورزێکی سەربازی بێ بۆ هێزەکانی بەعس کەلە باشورەوە کەڵەکە کرابون.ئاسانترین پێگەیەکیش ئۆپەراسیۆنی تێدا ئەنجامبدرێت وگەرنتی سەرکەوتنی هەبێت سنوری هەڵەبجە بوو.دانیشتوانەکەی

خوازیاری قوتاربون بون لەرژێمی بەعس،هاوکات هێزە کوردیەکان لەئامێزی ئێراندا لەو دەڤەرەدا بـەهێزببون وهاوکـاری هەمـاهـەنگی تـەواویان دەکەن،لـەم میانەیـەدا ئێـران سـودی لـەبێ پرۆژەیـی ونـەبونی سـتراتیژیەت رۆیـای ئاینـدەی حزبـە کوردێکـانی وەرگرت،هاوکـات بەرژەوەندی حزب ودەستکەوتنی چەندپارچـە چـەکێك وماشـێنی سـەربازی دەخاتـە بەردەسـتیان ومەبەسـتەکە دەپێکێت.

بۆ ئەم مەبەستە ئێران کۆبۆنـەوەی لەگـەڵ پـارتی‌و یـەکێتیی‌و ئیسلامی وسۆسیالست(مەجلیسی ئـەعلا)ی رێکخست بڕیـاری هاوکـاری وئێـران درا هەربەشـداربویەك دوو نوێنـەری لەسـنوری هێرشـەکە دیـاریکرد بـۆ نوێنەرایـەتی کـردن. ؟لەدانیـشتنەکانی ئاینـدەدا...پاشـان ئێـران بـەهاوکاری حزبـە کوردێکـان کەوتنـە زانیاری کۆکردنەوە لەسەر سوپای عێراق وناوچەکە،بەرپرسێکی یـەکێتی دەڵێـت:_ماوەیـەکی زۆر کـاربۆ کوکردنـەوەی زانیـاری کراوە...تەنانەت کامێرای ڤیدیۆی بەهاوکاری جـاش وخەفیفـەکان کەپەیوەنـدیان بەپێـشمەرگەوە هـەبوو براوەتـە نـاو سـەربازگەی(دەڵەمـەڕ ووێنـەیان گرتـوە).بەرپرسـێکی بـالای بزوتنـەوەش دەڵـێ:_دووسـێ مـانگ تـەدریب بەهێزەکوردیـەکان

کراوه لەباختەران واتە کرماشان..هەرحزبێك سەدان ئەندامی ناردووه.

لەکرماشان..بەمەبەستی تەنسیقکردن وپلاندانان ودابەشکردنی قۆڵەکانی شەڕ وهێرش کردن بۆهەڵەبجە بەئامادەبونی نوێنەرانی سەرجەم لایەنە کوردێکان ونوێنەری مەجلیسی ئەعلا وبەسەرپەرشتی ئێران کۆبونەوەی کرماشان سازکرا،لەو کۆبونەوەدا بۆ ڕازیکردنی هێزە کوردێکان چەند خاڵێك تاوتوێکران گرنگترینیان:

١-ئەو ناوچەکوردیانەی ڕزگار دەکرێن بدرێنە دەست هێزە کوردێکان.

٢-زامن کردنی خواردن وسوتەمەنی بۆ ناوچە ڕزگارکراوەکان لەلایەن ئێرانەوە.

٣-شەهیدانە بۆ بنەماڵەی شەهیدان وچارەسەری بریندارەکان.٤-کارەبا لەشاری پاوەوە ببرێت بۆ هەڵەبجە ودەوروبەری.

٥-ئاوەدانکردنەوەی گوندە ڕاگوێزراوەکان.

٦-دیلە عەرەبەکان بدرێنە دەست ئێران ومجلسی ئەعلا ودیلە کوردەکانیش بدرێنە دەست هێزە کوردێکان.

٧-چەکی قورس بۆئێران وچەکی سوك بۆهێزە کوردێکان.

٨-ڕژێمی ئێران بە بێ بزاڤی کوردی جەنگ ڕانەگەیەنێت.

لەم پەلامارەدا حزبە کوردێکان ڕۆئیای ئایندەیان لاواز بووە وستراتیژیان نەبوو چونکە ئەوکات نەدەبوو بەهیچ شێوەیەك لەحاڵەتێکی وادا ڕازیبن هێرشبکرێت،نەك بەشداریبکەن لەماڵوێرانکردنی زیاتر لەسەدان هەزار کورد لەئەنفال وهەڵەبجە،خوێنەر لێرەدا ئەم خاڵانە بخوێنێتەوە دەزانێ کەبزوتنەوەی کوردیمان فرێ بەسەر سیاسەتەوە نییە لەوەش تێدەگات هێزی کوردی بێ بەرنامە وپلان بووە...وە لەوکۆبونەوەشدا قسە لەسەر ئەوە کراوە نەخشەیەکی جەهەنمی تر لە سێ قۆڵەوە شاری سلێمانی داگیر بکرێت ئێدی چی دەبێ بابێ چش لەخەڵك ونیشتمان وهێزەکانیش لەتاسلوجە یکبگرنەوە...لەم کۆبونەوەدا ئێران هەستی بەوە کردبوو کەهێزە کوردێکان تەبا ویەك دەنگ نین وهەریەك لەئاوازێك دەخوێنێت بۆیە بەرژەوەندی ئێران وای دەخواست کە بەدوو قۆڵی کۆبونەوە لەگەڵیان بکرێت..بۆئەوەی پابەندی ئەو داواکاریانەش نەبێت کە حزبە کوردێکان داوایانکردون ، ئێران ئامانجی خۆی پێکا .

بەقسەی بەرپرسی حسك ویەکێتی هەر قۆڵێك هێرشکردنی سپارد بەحزبێك بەم شێوەیە ئێدی زەنگی تراژیدی ڕوی دا.

١-بەرزایەکانی ملەخورد بەرەو گوندی زەڵمو ئەحمەدئاوا ویالانپێ وهانەی قوڵ وخورماڵ بۆپارتی.

٢-تەوێڵە وبیارە لەقۆڵێك وگوندەکانی(هەوارەکۆن وشاخی شنرویَ تاویرە وعەبابەیلیَ وهەڵەبجە وسیروان بۆ یەکێتی.

٣-چیای سورێن وشیرەمەڕ گوندی قەفەری وگرتنی زەڵم بۆرێگرتن لەئیمداداتی ڕژێم بۆسۆسیالست.

٤-هاریکاری لۆجستی وگوندەکانی بۆین وچنارە وگردەنازیَ وپریس بەرەو بەکراوا سیروان بۆبزوتنەوەی ئیسلامی.

لەگەڵ هەربەرپرسێکی کورد سیَ ئەفسەری پلەداری ئێرانی لەگەڵ هەر حزبێکی کوردیدا٢٠٠تا٣٠٠پاسدار وفەیلەقی ٩ی بەدریان لەگەڵ بوە.

بڕیاردرا١٠\٣هێرشەکە دەستپێبکات.

پێش هێرشەکە لەدۆڵی جافایەتی بنکە وبارەگاکانی یەکێتی کەوتبوە بەرشالاوێکی بەهێز ودڕندانەی بەعس وبارودۆخی سەرکردایەتیان زۆرخراپ بوو.بەرپرسێکی یەکێتی وتبوی گەر پەلە نەکەن لەدەستپێکردنی هێرشەکە ئەوا هێزەکانی ڕژێم لەدۆڵی جافایەتی ئێمە هەڵدەکەنن ئەم بەرپرسە دەڵێت:_مژدەی دەستپێکردنی ئۆپراسیۆنەکەم بەلاسلکی گەیاندە سەرکردایەتی دەمزانی عێراقی گوێیان لیَ دەبێت ئەمەم بۆ سوکردنی

هێرشەکەی سەر سەرکردایەتی کرد)).دەزگای هەواڵگری عێراقیش لـــەرێی ئەنـــساتەکانیەوە ئـــەم هەواڵـــە دەگـــرێ..ڕژێـــم بـــۆ بەسـەرکردنەوەی دەڤەرەکـە چـەند ئەفـسەرێکی بـاڵا دەنێرێتـە سەرچیای بەفری میری...نزیك گوندی سازان وئێرانیش بـەخێرایی موقـــەدەم تـــارانی دەنێرێـــت ونیگـــەرانی خۆیـــان دەگەیەننـــە بەرپرســـێکی یـــەکێتی کـــە هـــەوڵی دزەپێکردنـــی هێرشـــەکەی دزەپێکردوە بۆ بەپاسـاوی کـەش وهـەوا سـەعاتی سفر دەگۆڕن بۆشـــەوی ١٢-١٣\٣\١٩٨٨...ڕۆژێـــك پـــێش دەســـتپێکردنی هێرشـــەکە هێزێکـــی سوسیالـــست پێـــشڕەوی هێـــزی ســـوپای پاسـدارانیان بۆدەشـتی شـارەزوور بۆپێـشگرتن لەسـوپای عێـراق وڕێگرتن لەهاتنی هاوکاری سەربازی ولۆجستی.

کاتـژمێر٢٠:١٠ شـەوی١٢-١٣/٣/١٩٨٨هێرشـی ئێـران وهێـزە کوردێکان بەپاڵپشتی بۆردومـانی خەسـتی تۆپبـاران دەسـتیپێکرد وئۆپراسیۆنەکەی ناونا(والفجر١٠).

ڕۆژی١٣-١٤-١٥\٣\١٩٨٨هێرشـــەکە بـــەردەوامبوو هـــەتا ڕۆژی١٥\٣هەرحزبێك لەو قۆڵـەی خۆیـەوە ئـەو شـوێنەی بۆدیـاری کرابوو لەگەڵ پێشەنگی سـوپای ئێـران ئامانجەکـەی جێبـەجێکرد هێزەکانی یەکێتی پێشەنگی هاتنە هەڵەبجە بون..دواتر هێزەکانی بزوتنەوە ئەمجار هێزەکانی تر گەیشتن...ئـەو دەمـە تـەنها حزبـی

شیوعی بەژداریان نەکرد ئەویش نەك لەبەر ئەوەی مێژویان شكۆدار ودووركە سازش‌و ناپاكی ، هەرگیز نا...نا ، بەڵكو لەبەر ئەوەی روسیا لەو سەردەمەدا بەرژەوەندێكانی لەگەڵ بەعس لەوپەڕی بەهێزیدا بوو هەروەها ئەو شەڕەیان بە پیلانێكی ئیمپریالیزم دادەنا ئەگینا لەسیاسەتی چەوت وهەڵە وناپاكی كەس هێندەی حزبی شیوعی تاجی ئەو شەرەفەی لەسەر نەناوە،باشترین نمونەش سالّی ١٩٧٥(پ.م)ەكانی شیوعی پێشڕەوی دەبابەكانی بەعس بون بۆ لەناوبردنی گوندەكانی كوردستان وتواندنەوەی بزوتنەوەی كورد.

## هێزی پەلاماردەری ئێران‌و بزوتنەوەی چەكداری كوردی

پاش شكستی چاوڕوانكراوی هێزەكانی بەعس ودابەزینی هێزی كوردی وئێرانێكان ومجلسی ئەعلای سەر بەئێران كارە دزێوەكانی تالآنی وفەرهودی فەرمانگەكان لەلایەن دەسەڵاتدارانی نوێوە دەستپێكرد وكەوتنە فڕاندنی سەیارە ومومتەلەكاتی دائیرەكان، ئەم نەریتەش لەسالّی١٩٩١جارێكی دی كورد دووبارەی كردەوە، ئەمجار كێشە وكێبەركێ بۆداگیركردنی بیناكان لەكاتێكا

فەرهودچـێکانی کـورد سـەرگەرمی دەسـتکەوت بـون خـەڵکی هەڵەبجـەش چـاوەڕوانی کاردانـەوەی تونـدی بەعـسێکان بوون..خـەڵکی هەمیشە لەپرسیاردا کە چی بکەن...بەرپرسی هێـزە کوردێکـان بەخـەڵکیان ڕاگەیانـدبوو کەداگیرکـەری ئێـران دەیانپارێزێ ولەشوێنی خۆیان بن .

هەر لەوکاتەدا قایمقامێکی ئێرانی دانرا بەناوی عبدالرزاق وکرا بەشارێکی ئێرانی.

لەوکاتـەدا هەسـت بـەجموجوڵی نائاسـایی دەکـرا...ئـەوەی توانی..خزمەکانی خـۆی دەرکـرد ولەشـار دوری خـستەوە پاشـان یـەکێتی بارەگـای خـۆی بـردە گونـدی عەبابـەیلێ حـسك چـونە سـورێن..لـەزمانی بەرپرسـێکی بـاڵای بزوتنـەوە گـوتی:ئێمـە دەمانزانی ڕژێم لە١٦مانگ موشەکی زەمین بەزەمینی هێناوەتـەوە ناوچـەی قـەرەداغ وڕوی لەهەڵەبجـە کردبـون...زۆرێـك لەهەڵەبجەیەکان هەوڵیان دا شەو لەشار بچنەدەر بەڵام پێشمەرگە نەیانهێـشت شـار چـۆڵ بکرێـت..ئەمـەش یـەکێکی تـر بـوو لەتاوانەکانی هێزی کوردی بۆقڕ کردنی نەتەوەکـەی خـۆی کـە بـێ هـیچ حـساباتێك لـەپێناوی بەرژەوەنـدێکانی خـۆی خـەڵکیان کردوەتە قەڵخان.

بۆیە هەمیشە لەسیاسەتدا دەکرێ مرۆڤ بەس چاوەڕێی ناشرینیو قێزەونی لەهێزە سیاسێکانی عێراقی وکوردی بکات کە هەمویان هاوشێوەی یەکترن بەتازەکانیشەوە کە١٠٠ساڵی دیکە دێن.

لە١٦\٣\١٩٨٨دووئەفسەری ئێرانی داگیرکەر بە سەرکردایەتی علی رەزا ودهقانی هاتنە هەڵبجە وداوایکرد لەحزبە کوردێکان لەقایمقامیەت کۆبونەوە ساز بدەن بۆچارەسەر کردنی هەندێك خروقات...لەکاتی کۆبونەوەکەدا فرۆکەکانی ڕژێمی بەعس هێرشەکانی چەکی کیمیاوی دەستیپێکرد وشاری هەڵەبجە خەڵتانی خوێن وبۆن کراو بوە قوربانی سیاسەتە هەڵکانی بزوتنەوەی کوردیو ئێرانی داگیرکەر وفاشستەکانی عروبەی بەعس.

دوایی تێکشکاندنی بنکە وبارەگاکانی یەکێتی وحزبەکانی دیکە لەناوچەکە کەمانگی شوبات ڕویدا بەناچاری هێزەکانی بزوتنەوەی کوردی بەرەیەکی دیکەیان لەشاروچکەی هەڵبجەی سنوری شاخەکانی سورێن ملەخورد وسنوری هەورامان کردەوە بۆ فشارخستە سەر هێزەکانی سوپای عێراق وسنوردانان بۆلەشکرکێشی بەدناوەکەی ئەنفال بەلام ئەمە بەهەمو پێوەرێکی سەربازی گەورەترین هەڵەی بزوتنەوەی چەکداری ولەڕوی

سیاسیشەوە بەوپێ یەی دەستێکی داگیرکەرێکی دێنێ بۆ وڵاتەکەی خۆت بەناپاکی دەژمێردرێ وەکو ئەوەی ئەو ناپاکییەی لە٣١ی ئابدا لەلایەن پارتیەوە دژ بەهێزەکانی یەکێتی کرا.

ئەو رێکەوتنەش کەلە لاپەڕەکانی پێشودا باسمانکرد بەشێك بوون لەو ستراتیجیە سەربازییەی نێوان ئێران،پارتی،یەکێتی وحسك.بزوتنەوەی هێزی بەدری سەر بەئێران، سەرەڕای ئەو دوژمنایەتیە مەزهەبیە لەمێژینەی ساڵەهای ساڵی سونە شیعە گیانی هەزاران کوردی کردە قوربانی وکوردوستانیان کردە مەیدانی یەکلایکردنەوەی جەنگە مەزهەبی پارسەنگی هێزەکانیان. ئەمەش یەکێ لەتاوانە هەرەگەورەکانی بزوتنەوەی کوردی نیشان دەدات کە لەسیاسەتی ساڵانی هەشتادا ئەنجامی دا وپەرداخی ژەهراوەکەشی نۆشی کە بەئەنفالکردنی دەیان هەزارکورد وشەهیدکردنی دەیان هەزار خەڵکی بێ گوناهو بێ دیفاع بوو کە ئەمڕۆ لەگۆڕە بەکۆمەڵەکان دەبینرێنەوە.

لەماوەی چەندین ساڵ خوێن ڕشتنی نێوان عێراق وئێران ودژایەتی سەختی یەکتر حزبە کوردێکان توانیان لەسەرەتای جەنگەکەدا سود لەم شەڕە ببینن بەڵام لەکۆتایەکانی ساڵی١٩٨٨ئەم جەنگە بەپێچەوانەی خواستەکانی بزوتنەوەی کوردی هاتە کایەوە بەتایبەتی کاتی تێکشکانی هێزەکانی ئێران

دەستپێکرد وپرۆسەی ئەنفال بەدوایدا هات حکومەتی عێراق لەسەرتای ساڵی١٩٨٨وردەوردە سەرکەوتنە سەربازێکانی دەستی پێ کرد.

تاکاتی ئابلۆقەدانی سەرگەلۆ وبەرگەلۆ کەسەرکردایەتی یەکێتی لێبوو ، دوایی دووهەفتە خۆراگری وشەڕ لەدژی سوپا زەباحەلاکەی بەعس یەکێتی ولایەنەکانی دیکەی کورد ناچاربون بەرەیەکی دی جەنگ بەهاوکاری ئێران بکەنەوە لەم ڕۆشەوە پێشمەرگە هەڵەبجەی هەڵبژارد بۆ چاوبەستنەوە ودورخستنەوەی هێزەکانی عێراق لەوناوچەیە بەلام ئەم پیلانە بەتراژیدیایەکی حساب بۆنەکراو شکایەوە ئەو هاوپەیمانییەتیەی لەگەڵ ئێران کە بەنیازی سود وقازانجی گەورەبون کەچی بەئیفلیجی لەدایك بوو بەڵکو لەهەمان کاتدا لایەنی کوردی ئەوەی دا بەدەستی عێراقەوە کەئێران وکورد لەیەك سەنگەردان وەك یەك تەماشا بکرێن..لەکۆتای شوباتیشدا هێزی سەربازی عێراق موشەکی دورهاوێژی لەدژی شارەکانی ئێران موشوك باران کرد..ئەودەمە رژێمی بەعس چوارەمین سوپا بوو لەجیهاندا.

هەموئەم ڕوداوانەش مەبەست لەپاڵ پێوە نانی ئێران بوو بۆسەر مێزی وتووێژ بەپێ هەلومەرجێکی لەبار وگونجاو بۆبەغدا.

لەدووهەفتەی یەکەمی مارتدا بەردەوام ڕاپورتەکانی هەواڵگری عێراق سەرنجی مۆلخواردنی گاردی شۆرشی ئێران وپێشمەرگەیان دەدا لەرۆژئاوای هەلبجە ، لەگەڵ تۆپبارانی شاروچکەی نزیکی سەیدصادق کە لەلایەن هێزەکانی ئێرانەوە لە ١٣مارسدا ئێرانییەکان بەرەسمی ڕایانگەیاند کەلەناوچەی هەڵبجە هێرشێکی نوێیان دەستپێکردوە بەناوی (زەفەر٧)بەگوێرەی ڕادیۆی تاران هێرشەکە لەلایەن هێزێکی هاوبەشی (پ.م) و پاسداران ئەنجامدراوە لە تۆڵەی پەلامارەکیمیاویەکانی عێراق بۆ سەرکورد...بۆرۆژی ئایندە هێرشێکی دیکەی هاوبەشیان کرد بەناوی(بیت المقدس٤)ەوە چەند میلیان ماوە بگەنە سلێمانی.لە١٦مارسدا تاران هێرشێکی دیکەیان ڕاگەیانند بەناوی (والفجر١٠)ئێران بەلوتبەرزیەوە وایی پشاندا کەلەشاروچکەی دەربەندیخان نزیکبونەتەوە٨٠٠کیلومەتری چوارگۆشەیان لەخاکی عێراق داگیرکردوە لەگەڵ١٠٢گوند بەڵام گەورەترین بانگەشەی ئێران شانازیکردنی بوو بەرزگارکردنی شاری هەڵبجە کەلەلاپەرەکانی پێشودا باسی پیلانی هاوبەشی هێزەکانی (پ.م)ی تارانمان کرد.

هەڵبجە بۆماوەی ٣رۆژ لەلایەن تۆبخانەی ئێرانەوە بەرزایەکانی دەوروبەری تێکدەشکان وسوپای عێراقە بۆناوشار

هەڵدەهات..لەم جەنگەدا عێراق نیازی نەبوو هێزی پیادەبخاتە شەڕەوە چونکە ستراتیجێکی لەوە دۆزەخیانەتری لەمێشکدابوو.ئێران هەر لەشەوی ١٥ی مانگەوەی بەناوشار ودەروبەری شار لەگەڵ پ.م سلاَویان لەخەڵك دەکرد وداوایان لێدەکردن نان شێوانیان بۆ ئامادە بکەن هەندێ لەوپاسدارانە پرسیارئەوەیان دەکرد ئاخۆ کەربلاو نەجف چەند لێرەوەدورە.

چەکدارانی بزوتنەوەی ئیسلامی عێراق بەبۆنەی داگیرکردنی هەڵبجەوە لەبەردەم بارەگای ئەمن وئیستخبارات شایان دەکرد...بەلاَم هەڵبجەیەکان هەمیشە لەچاوەڕوانی بەلاَو مەترسیەکی گەورڈابون بەتایبەتی لە١٥ی مانگ بریاردرا فەرمانگەکان چۆڵ بکرێت..بروسکەیەکی ئەمن لەرۆژی ئایندەدا بەئاشکرا باس لەزەرورەتی گورزێکی سەربازی توندو بەهێز دەکات.

لەرۆژی ١٦ی مارس ٨٨فرۆکە جەنگیەکانی عێراق لەکات ژمێر ١١بەدواوە پەلامارەکانی بەشیوەیەکی ئاسایی دەست پێکردو لەلای سەیدسادقیشەوە تۆپبارانی شاری هەڵبجەی دەکرد بەلاَم فرۆکەکان بۆمبە کیمیاوی وفسفۆری بەسەر خەڵکی هەڵبجەدا باراندوو یەکێ لەکارەساتە گەورەکانی مێژوی مرۆڤایەتی خولقاند...

هێزی سەربازی ئێران وهێزی پ.م تێکشکان وبەرەوسنورەکان هەڵهاتن خەڵکەکەش بونەقوربانی سیاسەتە چەپەڵەکانی کورد وبەعس وئێران...بەهەزاران کەس بونەقوربانی پەلامارەکانی ئەم هێزانە کە لەپێناوی مانەوە وبەرژەوەندی خۆیان شار بەشار وگوند بەگوندیان دەکردە قوربانی.

١٦ی مانگ ئێوارە من وابوڤیان لەگوندی زینانەی خواروبوین ئێستاش بیرم دێ بەتەنها لەخواری گوندەکەوە پیاسەم دەکرد..وەك سالآنی منالّی...لەدەشتایەکانی گەرمیان کەخۆرئاوا دەبێ جۆرێك دیمەنی سیحراوی لەلێوی سوری خۆرەتاو دەبخەشنە هەست وسۆزت..ئەو ئێوارەیە ڕادیۆ توشیبایەکەم کردەوە بۆسەر ئێزگەی لندن بەشی عەرەبی..یەکەم هەواڵی کیمیاباران کردنی هەڵبجە بوو کاتێ سەرژمێری کوژراوەکانی ڕاگەیاند..ئێستاش لەخەیاڵمە ئەودەمە ١٦ساڵ بوو تەمەنم،بەپەلە بەشپرزەیی خۆم بەدیوەخانی ئەوماڵەدا کرد کەلەوێ بریار بووشەو بمێنینەوە....

بێ سلاّوکردن..(بەشپرزەیەوە..وتم:_ابوڤیان هەڵبجە بەکیمیاوی ئیبادە کرا).نەمدەزانی ڕاوەستم یان دانیشم..هەمو لەدیوەخانەکەدا سڕبون..ابوڤیان پی وتم:_کێ ئەم هەواڵەی

گەیاند...منیش گوتم ئیزگەی لندن ..پێ وتم :_وەرە دانیشە ڕادیۆکەم بەرێ.

بەپەلە شەپۆلی ڕادیۆکەی دەگۆڕی وخستیتە سەر ئێزگەکانی ئێران هەواڵی شەهیدبونی هەڵبجە گەرم بوو وەك تیشکی هەتاو وردەوردە ڕوی لەماڵەکان وشارو وڵاتان دەکرد.. بێ ئەوەی دۆستە بێ هەڵوێستو وبێ ویژدانەکانی ئەمرۆی کورد ورتە لەدەمیانەوە بێت، بێ ئەوەی مافی مرۆڤ ڕاستەیەك بنوسێ، ئەمریکای داگیرکەر یەکێ بوولەو وڵاتانەی دیگوت عێراق لەجەنگدایە حەقی شەرعی خۆیەتی هەرچییەك بەکاربێنی..ئەمەش لەزمانی ڕامسفێلدەوە وترا..دوایی گرتنی سەرکردایەتی یەکێتی پاشەکشەی پ_م بۆقەندیل..هێزەکانی عێراق پەلاماری ناوچەی قەرەداغیان دا لەوێش کارەساتەکان یەك لەدوای یەك ڕوی دەدا ومەبەستی لەشکری عێراق بۆتەواوی هێزەکانی عێراق بزوتنەوەی کوردی وچەکداری ئاشکراوڕون بووەوە.ئەنفال بەپیسترین شێوە دەستی پێ کرد.ئەمجار ڕادیۆکانی عێراق لەسەر لافاوی خۆێنی کورد تەپڵی سەرکەوتنیان ڕاگەیاند ولەبەیانامەیەکدا گرتنی سەرکردایەتی یەکێتیان ڕاگەیاند وسەدام حسێن لەوتەیەکدا ڕاگەیاند...وتی:_((شەرتە دەبێ وایان

لێ بکەم تف ولەعنەت لەو ڕۆژە بکەن کە لەدایك بون))هەرواش دەرچوو..

دوایی هەڵبجە بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتی زۆربەری نەگرت لەکاتژمێر دە ودقیقە شەوی ١٨ی ئازار یەکەکانی سوپا ڕژانە ناو سەرگەڵۆەوە زیانێکی قورسیان لەوانەدا کە تادواهەناسە بەرگریان کردو بە دەیان (پ.م) شەهید بوون..بەرگەلوش دوایی نیوەرۆگیرا..ئیدی ڕادیۆی عێراق هەواڵەکەی بەخۆشحالیەوە ڕاگەیاند ولەشارە حەیاتەکەی سلێمانی وهەولێری ئێستا شایی ولۆغان بۆسەرکەوتنی بەعس دەگێڕدرا وخوێنی پ_م کوردیش لەدەرئەنجامی هەلومەرجێکی ناسروشتی وشپرزە وتۆلەکردنەوەدا دەشت وشار وگوندەکانی داپوشی بەمەش مێژویەکی دی لەژیانی سیاسی وسەربازی کورد وعێراق ڕویدا ولە١٩٨٨\٨\٨جەنگ کۆتایی هات..ئەو ئێوارەیە خەڵکی شاری بەغدا ڕژانە سەرمەیدانی ئەهەنگەکانی بەغدا بەسەدەها کەس لەتەقەی خۆشی بریندارببوو.

لەولاشەوە لەمانگی ٥دا هێزەکانی ئێران یەك لەسەر یەك تێکدەشکان بەم جۆرە ئووستورەی سەدام دونیای عەرەبی وجیهانی گرتەوە بەرژەوەندێکانیش لەسەروی مرۆڤ ودیژانەوە کاری خۆی دەکرد.

ئەوەی پیویستە بوترێ لەکۆتایی ئەم کتێبەدا ئەوەیە کە مێژوی رۆژهەلاتی ناوەڕاست وبەشێکی گەورەی جیهان کارکردن بوە لەسەر بەکۆیلەکردنی ئینسان شێوازەکانیش لەسەدەیەکەوە بۆ سەدەیەکی دی گۆڕان بەڵام لەجەوهەردا هەمان مانا و فۆرمی بەخشیوە..کارەساتی ئەنفال تەنها صدام حسێن لێ بەرپرسیارنەبوو بگرە ئێران وبزوتنەوەی چەکداری کورد ناڕاستەوخۆ بەشێك بون لەوپرسە قەتلّ وعامە ئەمەش داکۆکی کردن نیە لەسەدام بەقەد ئەوەی وتنی ڕاستیەکە بۆ مێژوو دەبێ بووترێ....ئەگەر چی هۆکاری سەرەکی صدام و ڕژێمەکەی بوو.

مەبەستی ئەم کتێبە سەردی مێژوی ئەنفال نیە بەڵام وام بەباشی زانی کە بەشێك لەڕوداوەکان بخەمە سەرلاپەرەکان کەخۆم لەنزیکەوە وەك (پ.م) لەڕابردودا ئاشکراکەم ئەمەش یەکێکە لەو ڕوداوانەی لەناو سەدەها ڕوداوی دڵتەزینی تر لەکاتی پرۆسەی ئەنفال لەڕوی داگیرکەری رژێمی عێراق لەبەرنگاری وشەڕو خۆڕاگریدا بوین...ئەمرۆ..هەمو ئەفسانە وخەونەکانی ڕابردومان بوەتە گەورەترین ئازاری ڕۆژانە تیایدا ژیانمان بەهەدەر وخەسار دەدات...

ئەم بابەتە لێکۆڵینەوەیەکی فیکری وسایکۆلۆژی رژێمە تۆتالیتارەکانی جیهانە...هەروەها ئەو تێزو چەمکانەی

یارمەتیدەربون بۆدروستکردنی جەلاد وقوربانی بەدرێژای مێژوو هۆکار وسەرهەڵدانیان کەمێژویەکی دورودرێژی لەقڕکردنی ئینسان هەبوە.

جێ داخە ئەمڕۆ ئەنفال بەجۆرێکی دی لەسەر تاکی کوردی و رۆژهەلاتی ناوەڕاست بەڕێوە دەچێ وبەها ئەخلاقی وئینسانێکی وردوخاشی کردوە وبۆ ئێمەی نەوەی شەڕ وکوشتارە گەورەکانی ئەنفال وهەڵەبجە کارەساتێکی سایکۆلۆجی گەورەی بۆ بەجێ هێشتوین؟.ئەنفالی سەدەی ٢١ئەنفالی سیستمی نوێ کوردی وعێراقیە کە لەسەر ئاستی گەندەڵی ونەهێشتنی هێزی ڕۆحی ومەعنەوی کۆمەڵگای کوردی وعێراقی کاردەکات.

بەگژاچونەوەی ئەم هێزە سیاسیانەش لەئاستی ڕەخنەی وکاری جەماوەری هاوبەش وهۆشیارکردنەوەی خەڵکی بۆخۆی داستانێکی ئەخلاقی ومەعنەوی ڕۆشنبیری ترە هاوشێوەیە لەگەڵ داستانی ئەو پێشمەرگانەی سالانی هەشتاکان دژی داگیرکەری عێراق گیانی خۆیان بەخت دەکرد...تاکە چەکی ئەمڕۆی خەڵکی کوردوستانیش ئەو قەڵەم ومیدیا بەجورئەتانەیە کەڕوی درێوی سیستمە سیاسیەکان بەباری ڕاستەقینەی خۆیان ئاشکرا دەکەن...کە ئەمەش کارێکی سەخت وپشودرێژی ئەوێ هەروەها خەڵکی خەمخۆر وئینسانی دەوێ کە پڕچەك بێ بەپاشخانی

عـەقڵی ومەعنـەوی وویـژدانی تـابتوانیٚ لـەناو نوسـراوی ملیۆنـا مێژووی درۆدا حەقیقەتێك بوروژێنیٚ كە كار لەسەر ژیان وكولتوری بەعـسیزم وعروبـە وجـەنگ بكـات وبیگۆرێتـەوە سـەر ژیـان ودۆسـتی...تـا هـیچ نـەبیٚ لـەم جـەنجاڵ ودەوەرانـەدا پیرۆزیەك،مانایەك بۆئەم پاشاگەردانییە بگێرێتەوە كەهەر مرۆڤێك پێویـستی بـەتۆزقاڵێك لەوانـە هەیـە تـا سـەربەرز وخەیاڵپـەروەر ومرۆڤانە بژیت.

ئـەم خۆكوژیـە رۆحیـەش ئاسـەوارەكانی نـەمێنیٚ...لـەیادی كارەساترین مەرگەساتی ئینسانی ئەنفال ( سەری رێـز وحورمـەتم بۆ هـەمو قوربانییـە بـیٚ تاوانـەكان ، كـەدڵنیام هـەر یـەك لەئێمـە وقوربانێكـان خۆشـیان بەشـێك بـوین لـەم پرۆسـەیەدا دادەنەوێنم...سەری رێـزم بـۆ شـەهیدە ئەفسانەیەكانی رۆژگـاری بەرەنگاری بەعس كە جارێكی دی بـەگومانم مرۆڤـی وەكـو ئەوانـە دروست بێتەوە كە ئەو مرۆڤانەش ناوی پیرۆزی پێشمەرگە بوو ).

لەكۆتایدا ماوە بڵێم ئەنفال پرۆسـەیەكی دەسـتەجەمعی گـشتی بەشەكانی ژیانی ئێمە بوە...بەبەژداری سیستمی مۆدێرن وكولتور وئاین وپەروەردە..سەرئەنجام ئەم ئەفسانەیەی لیٚ كەوتەوە...كە مێژوو لەبەشێك لەتۆڵە كردنەوەكانی خۆی بەرامبـەر بـە بێـدەنگی وكۆیلایەتی ئێمە نواندی...

هیوادارم نەوەکانی دوایی ئێمە ئەم ڕۆژگارە تاڵانە قەت نەبینن ونەبیستن وتیایدا لەحزەیەك نەژین..کەمن بۆخۆم بەگومانم ژیان سەرانسەر ئارام وئاشتی بێ، چونکە مرۆڤ بۆخۆی پەیوەندیەکی وجودی هەیە لەگەڵ تراژیدیا وڕوداوەکانی ناوەوەی خۆی ودەوروبەری.

ئەنفال پێ وتین:_بێدەنگ مەبن..ڕانەمەڕ مەبن...زەلیل مەبن...کۆیلە مەبن...سەرۆك پەرست مەبن..ئایدیۆلۆژیست مەبن...ئاین پەرستی کوێرانە مەبن...حزبی مەبن...ئەنفال پێ وتین:_هۆشیار بن...مرۆڤی ئازاد بن...ژیان دۆست بن....

له ناوەڕاستی (٢٠٠٧) تا (٢٠٠٩)ئەم کتێبە تەواو بووە

ئەو سەرچاوانەی سودی لێ وەرگیراوە

سەرچاوە عەرەبییەکان


١-ابو جعفر محمد بن جرير الطبري_تاريخ الرسول والملوك_دار المعارف١٩٦٠م

٢-احمد بن يحيى بن جابر البغدادي البلاذري_فتوح البلدان_لندن ١٨٦٦م

٣-ابن سلام ابو عبدالله قاسم_كتاب الاموال_القاهرة١٣٣٥هجري

٤-ابن جوزي_جمال الدين ابو فرج بن علي_المنتظم في تاريخ الملوك والامم١٣٧٥هجري

٥-ابن حقول_ابوقاسم محمد نصيبي البغدادي_صوره الارض لندن١٩٣٨م

٦-ابو نعيم الاصبهاني_احمدبن عبدالملك_حليه الاولياء وطبقات الاصفياء مصر١٩٨٣م

٧-حافظ ابن بكربن علي الخطيب البغدادي_تاريخ بغداد_دار الكتب العربي بيروت.

٨-احمد علبي_ثورة العبيد في الاسلام_دارالادب بيروت١٩٥٨م

٩-بروكلمان كارل_تاريخ الشعئب الاسلامية_ترجمة نبيه امين فارس ومنير البعلبكي دارالعلم بيروت الطبعة١٩١٨م

١٠-النزعات المادية في الفلسفة الاسلامية_حسين مروة دارالفارابي الطبعة السادسة١٩٨٨م

١١-العصر العباسي الاول بغداد_دكتور عبد العزيز الدوري.

١٢-من تاريخ التخريب في الاسلام_هادي علوي بيروت١٩٨٧م مركز دراسات الاشتراكية.

١٣-اسماعيل صادق_ماذا تبقى من صدام للتاريخ_الزهرا للاعلام العربي القاهرة١٩٩٤م

١٤-البعث العربي الاشتراكي_مبراته وابرزسماته_المؤسسة العربية بيروت١٩٧٥م
١٥-الدكتور منير الزراز_ازمة يسار العربي_دار الطليعة بيروت ١٩٧٣م
١٦-منهج القومي العربي لفريق الشبان العرب المؤمنين_الرسلة الاولى مطبعة المعارف ١٩٣٥م
١٧-الياس فرح_الفكر العربي الثوري_امام تحديات المرحلة_دار الحرية بغداد١٩٧٣م
١٨-الياس فرح_تطور الايدولوجية العربية الثورية_بيروت مؤسسة العربية للدراسات بيروت ١٩٧٢م
١٩-الياس فرح_الابعاد الفكرية والنظالية لتاسيس البعث_مؤسسة العربية بيروت١٩٧٤م
٢٠-باقر ابراهيم_صفحات من النظال_دار الكنوز بيروت_١٩٩٧م
٢١-حزب البعث العربي الاشتراكي_منهج الثقافي المركزي_للكتاب الثاني دارالحرية للطباعة بغداد١٩٧٧م
٢٢- حزب البعث العربي الاشتراكي_نظال البعث دارالطليعة بيروت ١٩٧٢م
٢٣-حسن سعيد_نواطير الحزب_صفحات من ملف العلاقة اللعبة الدولية مع البعث العراقي ١٩٤٨_١٩٦٨ مؤسسة الوحدة للدراسات بيروت ١٩٩٢
٢٤-عراق دولة سرية_حسن علوي_دار نشر بيروت١٩٩٠م
٢٥-دكتور حلمي محمد قاعود_هيتلرالشرق وبلطجي عراق ولص بغداد_دار الاعتصام للنشر القاهرة .
٢٦-علي وردي_لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث دار كوفان للنشر_لندن ١٩٩٢ج_٢
٢٧-ج_٥. قسم الاول ١٩٧٧ قسم الثاني بغداد ١٩٧٨
٢٨-علي وردي ج_٦.بغداد ١٩٧٦

٢٩-وميظلى جمال عمر نظمي_الجذور السياسية والفكرية والاجتماعية للحركة القومية العربية من العراق_مركز دراسات الوحدة العربية بيروت ١٩٨٤م
٣٠-شبلي العيسمي_حزب البعث الاشتراكي مرحلةالاربعينيات التاسيسية١٩٤٠_١٩٤٩ دار الطليعة بيروت ١٩٧٥
٣١-صدام حسين_تعبير النظري عن الواقع ص_دار الحرية للطباعة بغداد ١٩٧٩
٣٢-صدام حسين_العطاء المتجدد_دار الحريةللطباعة بغداد ١٩٧٩
٣٣-صدام حسين_المرونة في العمل الثوري_اسلوب للتقدم ام طريق للتراجع_دار الحرية بغداد١٩٧٧
٣٤-شبلي العيسمي_احاديث في قومية والتقدم_دار الطليعة بيروت ١٩٧٤
٣٥-شبلي العيسمي_الوحدة العربية من ظلال التجربة_هيدالبرج لندن ١٩٧١
٣٦-صدام حسين_الاعلانات القومي_استجابة للدواعي المسؤلية القومية دار الحرية للطباعة بغداد١٩٨٠
٣٧-صدام حسين_العرب والدور القيادي لرسالة الاسلام دارالحرية للطباعة بغداد ١٩٨٣
٣٨-صدام حسين_نظره في الدين والتراث_دار الحرية للطباعة بغداد١٩٨٠
٣٩-صدام حسين التراث العربي المعاصر دار الحرية للطباعة بغداد ١٩٨٠
٤٠-صدام حسين_الثورة والنظرة الجديدة_دار الحرية للطباعة ١٩٨١
٤١-محمود القاظي_العروبةوالجهاد_مطبعة النجاح بغداد١٩٦٠
٤٢-مصطفى دندوشلي_حزب البعث العربي الاشتراكي_الايدوليجيا والتاريخ السياسي بيروت١٩٧٤
٤٣-ميشيل عفلق_نقطة البداية_مؤسسةالعربية للدراسات والنشر بيروت ١٩٧٤
٤٤-ميشيل عفلق_النظال ضد تشويه حركة الثورةالعربية دار الطليعةبيروت١٩٧٥

٤٥-ميشيل عفلق_الثورة صراعات الحاظروالمستقبل بيروت
٤٦-ميشيل عفلق في سبيل البعث_دار الطليعة للطباعة والنشر الطبعة الرابعة العشرة بيروت١٩٧٥
٤٧-ميشيل عفلق_مختارات من اقوال المؤسس البعث سلسلة ثقافية ثورية بيروت.
٤٨-ميشيل عفلق_نظال في سبيل البعث دار الطليعة١٩٥٦ نظال البعث في سبيل البعث الوحدة والحرية والاشتراكية وثائق حزب البعث العربي الاشتراكي ١٩٤٣_١٩٤٩ من معركة الاستقلال الى نكبة فلسطين والانقلاب العسكري الاول ج_١دار الطليعة بيروت ١٩٤٩
٤٩-هاني الفكيكي_اوكار الهزيمة_تجربت من حزب البعث العراقي مؤسسة المنار ١٩٩٣
١
٥٠-اميل توما_الحركات الاجتماعية في الاسلام...
٥١-محمد جولي_الزعيم السياسي في مفيال الاسلامي_بين المقدس والهندسة_المؤسسةالوطنية للبحث العلمي_دار سراسر للنشر_تونس اكتوبر ١٩٩٢
٥٢-محمد اراغون_الفكر الاسلامي_ترجمة هاشم صالح.
٥٣-دولة النبؤة_هشام جحيط_مجلة فكر العربي المعاصر عدد ٧٢_٧٣ ١٩٩٥
٥٤-سمير خليل_جمهورية الخوف القاهرة١٩٩١
٥٥-ميشيل عفلق_في سبيل البعث ١٩٦٣
٥٦-ازمة الديمقراطية في الوطن العربي_دراسات مركز دراسات الوحدة العربية١٩٨٤
٥٧-في الحكم المدني_جون لوك_ترجمة ماجد فخري_بيروت١٩٥٨
٥٨-تعدد الاديان وانظمة الحكم_د جورج قرم_دار النهار للنشر ١٩٧٩
٥٩-ميشيل فوكو_تاريخ جنسانية+ارادة المعرفة_ترجمة ومراجعة وتقديم_مطاع الصفدي_ترجمة جورج ابنصالح مركز الانما القومي

٦٠-عالم علم النفس_دكتورعبدالمنعم الحفني_المجلد الثاني دار نوبليس_الطبعة الاولى ٢٠٠٥
٦١-عالم علم النفس_دكتور عبدالمنعم الحفني_المجلد الرابع
٦٢-نفي العقل_اديب دعيتري_مؤسسة للدراسات والنشر١٩٩٢

سەرچاوە کوردیەکان

٦٣-بەختیار عەلی_لە ئارەزوی کوشتنەوە بۆ فەرامۆشکردن ڕەهەند ژمارە-٧-
٦٤-قورئان بەزمانی کوردی وعەرەبی لەلایەن دەستەی زانایانی ئێرانەوە.
٦٥-ئەنفال ومۆدێرنە_مەریوان ووریاقانع_ڕەهەند ژمارە-٧-
٦٦-مێژوی عەرەبی ئیسلامی_محمد اراگون_ورگێرانی مەریوان وریا تالب مۆریاس.
٦٧-فەندمینتالیزمی ئیسلامی لە جیهانی عەرەبدا_ڕیچارد هارپەر وئاسۆکریم
٦٨-لەئەنفالەوە بۆخوێندنەوەی رووبەکی تاریکی ناسیۆنالیزمی عەرەبی بەرزان قەرەج_ڕەهەند.ژ_٧_
٦٩-ئەنفال جینۆسایدێك لەئایندا بۆرەوایەتی دەگەرێت_گۆران باباعلی_ڕەهەند_ژمارە٧
٧٠-هاوکێشەکانی دەسەلات...سزا_کۆنترۆڵ_کاریزما_مەریوان ووریا قانع_ڕەهەند_ژمارە٢
٧١-ئەفسانەی دەوڵەت..ئێرنست کاسیرە_
٧٢-ڕۆحی یاساکان_مۆنسکیۆ
٧٣-ناسیۆنالیزم وکوردایەتی_بەرەو پارادایمی نوێ_فاروق رەفیق_ڕەهەند_ژمارە٢
٧٤-ژیان ومەرگی خودپەرەستی_ڕەهەند_گۆران باباعلی
٧٥-جینۆسایدی کورد_دکتۆر فاروق گول

٧٦-نامەیـەك لـەبارەی سیاسـەتی ملکەچـیەوە_ئـاتێن دۆلاپـۆتی_وریـبـوار سیوەیلی_مراد حکیم
٧٧-بەربەریەت وقارەمان_رەهەند
٧٨-نەریتی فاشیزم_جۆن وایس_وکارزان کاوسین
٧٩-بنەماکانی تۆتالیتاریزم_هانا ئارێنت_وەرگێرانی حەمەرەشید
٨٠-خوێندنەوەی بەعس بۆفاشیزمی مێژوی_دالبێرت عیسا_٢٠٠٤
٨١-جینۆسـاید لەعێراقـدا_پـەلاماری ئـەنفال بۆسـەر کـورد_میـدل ئیـست ووچ٢٠٠٤و_محمدحمە صالح تۆفیق .

## سوپاس و پێزانین

ڕێزو حورمەتو پێزانینی زۆرم بۆ هاوڕێی دڵسۆزو بەڕێزم (کاک کۆسالآن) لە(فەرمانگەی پرۆژەکانی پارێزگای سلێمانی) کەئەرکی لەچاپدانی ئەم کتێبەی گرتە ئەستۆ، بێگومان ئەگەر هاوکاری‌و خەمخۆری ئەم بەڕێزە نەبوایە ئەوا ئەم کتێبە بەم زووانە ڕووناکی نەدەبینی... هیوادارم نموونەی کاک کۆسالآن زۆر بێت، دوبارە دەستخۆشی لێ دەکەم...